


# ئارامگرتن

## لە قورئان و فەرموودە صحیحەکاندا





نووسینی

**محمد ملا فائق شارەزووری**



چاپی دووەم

١٤٣٣ هـ — ٢٠١٢ م





📖 ناوی کتێب: ئارامگرتن لەقورئان وفەرموودە صەحیحەکاندا.

✍ نووسینی : محمد ملا فائق شارەزووری.

✍ وەرگێڕانی: م. ناصح مصطفى

❁ ژمارەی لاپەڕە: ١٥٤

❁نۆرەی چاپ: دووەم

❁ ژمارەی تیراژ: ٢٠٠٠دانە

❁ ساڵی چاپ : ١٤٣٣ هـ - ٢٠١٢ م .

❁ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٤٣٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێ دراوە.

**تێبینی :**

**بۆ دەست کەوتنی ئەم بەر هەمە بە(کۆ) پەیوەندی بکە بەم ژمارە مۆبایلەوە: ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده، ونستعينه،ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أنه محمداً عبده ورسوله.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران:١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب:٧٠-٧١).

**أما بعد:**

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار[(١)].

---

(١) هذه خطبة الحاجة التي كان الرسول ﷺ يفتتح بها خطبه ، ويُعلّمها أصحابه، ورويَ هذه الخطبة ستة من الصحابة (رضوان الله عليهم) وقد أخرجها جمع من الأئمة في مصنفاتهم، مثل: الامام أحمد في (المسند) (٢٧٢/٥)، ومسلم في (الصحيح) (٤٦٧/٥٩٢/٢) وفي (١٥٦,١٥٣/٦ ، ١٥٧- بشرح النووي)، وابو داود في (السنن) (١٠٩٧)، والنسائي في (المجتبى) (١٠٤/٣)، والنسائي (١٨٨/٣)، وابن ماجة في (السنن) (١٨٩٢)، والحاكم في (المستدرك) (١٨٢/٢-١٨٣)، (١٨٨/٣)، والطياليسي في (المسند) رقم(٣٣٨)، والبيهقي في (السنن الكبرى) (١٥٣٥) (١٤٦/٧) و (٢١٤/٣)، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (١٣٣١) وفي (المشكاة) (٣١٤٩) وفي (الكلم الطيب) (٢٠٥)، وانظره بتوسع في (خطبة الحاجة) (ص: ١٤-١٩).

برای موسوڵمانم خوای گه‌وره زیاد له نه‌وه‌ت جار له قورئاندا باسی ئارامگرتنی كردووه، وه پێغه‌مبه‌ری خواش ﷺ له ده‌یه‌ها فه‌رمووده‌ی خۆیدا باسی ئارامگرتنی كردووه، وه هاوه‌ڵانی به‌رێز و تابیعیه‌كان و زانایانی پایه به‌رز هه‌ریه‌كه‌یان به‌جۆرێك له‌جۆره‌كان ستایشی ڕه‌وشتی ئارامگرتنیان بۆ كردووین. چونكه له‌ڕاستیدا ژیان و ئاین وابه‌سته‌ن به ئارامگرتنه‌وه چونكه ئارامگرتن سه‌رچاوه‌ی سه‌رجه‌م ڕه‌وشته به‌رزه‌كانه و بڕواداریش ئه‌م باسه‌ی زۆر به‌لاوه گرنگه و پێویسته وه‌ك پێویستی ئاو وهه‌وا بۆ ژیان، وه بۆ ئه‌وه‌ی شادی و سه‌ربه‌رزی دونیا و قیامه‌ت به‌ده‌ست بهێنێت.

منیش لێره‌دا هه‌ستام به‌پشتوانی خوا به‌كۆكردنه‌وه‌ی هه‌موو به‌شه‌كانی ئه‌م بابه‌ته گرنگه له قورئان و فه‌رمووده صحیحه‌كاندا وه وته‌ی زانا به‌رزه‌كان، تا هه‌موو موسوڵمانێك ته‌واو له‌م باسه بگات و بێته مایه‌ی هێمنی و به‌خته‌وه‌ری زیاتر به‌هره‌مه‌ند بێت له‌م ڕه‌وشته به‌رزه. داواكارم له خوای گه‌وره ئه‌م نوسراوه‌مان بۆ بكاته مایه‌ی سوود و پاداشتی نه‌بڕاوه بۆ خۆم و سه‌رجه‌م برایانی موسوڵمانم، وه‌لێره‌دا پێویسته زۆر سوپاس و پێزانین و ده‌ست خۆشی خۆم له برای به‌رێزم (م. ناصح مصطفى) بكه‌م كه هه‌ڵسا به وه‌رگێڕانی ئه‌م به‌رهه‌مه له عه‌ره‌بیه‌وه بۆ كوردی وه پاشان خۆم پێیدا چومه‌ته‌وه، خوا نمونه‌ی زیاد بكات وزیاتر به ئاگای بكات له‌زانسه شه‌رعیه‌كان وئه‌م ئاینه به‌رزه‌مان وبیكاته نورو ڕووناكی بۆ خه‌ڵكان تا له‌ڕێگه‌یه‌وه موسوڵمانان باشتر له‌ئاینه‌كه‌یان ئاشنا وسودمه‌ندبن. وه داواكارم له‌خوای گه‌وره زانستی به‌سودمان پێ ببه‌خشێت وپه‌نامان بدات له زانستێك كه‌سودی نه‌بێت وه له‌سه‌ر ڕێگای هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ و ڕێگه‌ی پێشینه‌چاكه‌كان به‌ر ده‌وامان بكات تابه‌خزمه‌تیان شادببین له‌به‌هه‌شتی به‌ریندا. آمین.

**باوكی عبدالله**

**محمد ملا فائق شاره‌زووی**

**سلێمانی – العراق**

**پێناسه‌ی ئارامگرتن:-**

ئارامگرتن له زمانه‌وانیدا: (الحبس) بریتیه له خۆگرتنه‌وه.

وه‌ك گێڕدراوه‌ته‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ كه ڕێگری كردوه له كوشتنی گیانداران به ستنه‌وه‌یان ونیشانه لێ گرتنه‌وه‌یان وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ((قتل الصبر لا يمرُّ بذنب إلاّ محاه)).(گرتن و به‌ستنه‌وه‌ی مرۆڤێك بۆ كوشتن، گشت گوناهه‌كانی ئه‌و كه‌سه ده‌سڕێته‌وه)، هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێت: ((من حلفَ على يمين صبر))[٢].(كه‌سێك سوێندی درۆ بخوات بۆ ئه‌وه‌ی ماڵی كه‌سێك داگیر بكات ئه‌و كه‌سه له‌كاتێكدا ده‌گاته‌وه به خوا، خوای گه‌وره لێی توڕه‌یه).

ئارامگرتن له زاراوه‌ی شه‌رعیدا: بریتیه له خۆگرتنه‌وه‌ی نه‌فس به‌و جۆره‌ی كه ژیری و شه‌رع داوای ده‌كات. وه‌ك حه‌سه‌نی به‌صری (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: "هو الصبر عن محارم الله، والسماحة بفرائض الله". (بریتی یه له ئارامگری و خۆگرتن له قه‌ده‌غه‌كراوه‌كانی خوای گه‌وره وئه‌نجامدانی فه‌رزه‌كانی خوا).

حه‌جاجی كوری قه‌ریه ده‌ڵێت: "كظم الغيظ واحتِمال النائبة"[٣]. (ئارامگرتن بریتیه له شاردنه‌وه و قوتدانه‌وه‌ی ڕق و كینه وبه‌رگه‌گرتنی ناڕه‌حه‌تیه‌كان).

---

(٢) انظر: (النهاية في غريب الحديث والأثر) (٣/٧) ، (ولسان العرب) (٤/٤٣٨) ، ومن ذلك ايضا في الحديث الشريف عن انس (رضي الله عنه): ان رجلا كان في عهد رسول الله (ﷺ) يبتاع وكان في عقله ضعف... فدعاه النبي (ﷺ) فنهاه عن البيع فقال: اني لااصبر عن البيع. فقال النبي (ﷺ) (([ان كنت لاتصبر على البيع] فقل ها وها ولا خلابة)) ، واخرجه: ابو داود (٣٥٠١) ، والترمذي (١٢٥٠) ، والنسائي (٧/٢٥٢) ، والدار القطني (٢٩٨٩-٢٩٩٠) وقال محققه: اسناده صحيح واللفظ له.

(٣) انظر: (المفردات) للراغب الأصفهاني (٥٢٧٣) ، و (المجالسة) للإمام الدينوري رقم (١١٥٥ ، ١٧١٩) ، و (الحلية) لابي نعيم (٢/١٥٦).

ئیبن قەیم (رحمه الله) دەڵێت: "قيل: حبس النفس عن الجزع والتسخط، وحبس اللسان عن الشكوى، وحبس الجوارح عن التشويش، وقيل:هو ثبات القلب عند موارد الاضطراب". (ئارامگرتن بریتیە لە گرتنی نەفس لە دەربڕینی بێزاری و ناڕەزایی، وەگرتنی زوبان لە وتەی ناشیاو، وەگرتنی ئەندامەکانە لە شڵەژان و شپرزەیی).

وەوتراوە: "هو الوقوف مع البلاء بحسن الأدب"[٤]. (ئارامگرتن بریتیە لە وەستان وخۆڕاگرتن لەگەڵ بەڵاو موسیبەتدا بەشێوە ونەریتێکی جوان).

وەطەبەری (رحمه الله) دەڵێت: "الصبرُ: منعُ النفس محابها وكفها عن هواها"[٥]. (ئارامگرتن بریتیە لە خۆگرتنەوەی نەفس لەوشتەی خۆشی دەوێت، و گێڕانەوە و دوورخستنەوەی لە ئارەزووە ناڕەواکانی).

وە سعیدی کوڕی جوبەیر رضي الله عنه دەڵێت:" الصبر إعتراف العبد الى الله بما اصابه، وإحسانه اليه رجاء جزائه، وقد يجزع الرجل وهو لا يرى منه الا الصبر"[٦]. (ئارامگرتن دان پێدانانی بەندەیە بۆ خوای پەروەردگاری بەوەی کەتوشی هاتووە وە ئەنجامدانی چاکەکانە بەهیوای پاداشتی ڕۆژی دوایی، جاری وا هەیە پیاو لە ناخیدا زۆر شڵەژاوە و تەنها ئارامگریشی پێوە دیارە).

---

(٤) انظر: (مدارج السالكين) (١٦٢/١).

(٥) انظر: (فتح الباري) (٢٢١/٢).

(٦) انظر: (الزهد) لابن المبارك (١١١) ، و(الصبر) لابن ابي الدنيا (١١٣) ، و (المجالسة) للدينوري (١٧٠٧).

**پله‌کانی ئارامگرتن:**

(مراتب الصبر خمسة: فالصابر أعمّها، والمصطبر: المنتسب للصبر المبتلى به، والمتصبر: متكلف الصبر و حامل نفسه عليه، والصبور: العظيم الصبر الذي صبرهُ اشد من صبر غيره، والصبّارٌ: الشديد الصبر فهذا في القدر والكم، والذي قبلهُ في الوصف والكيف)(٧).

١- صابر: واته ئه‌و كه‌سه‌ی له‌ئامگرتندا گشگیرتره له هه‌مووان.

٢- المصطبر: واته ئه‌و كه‌سه‌ی ئارامگره و توشی دان به خۆداگرتن و ئارامگری هاتووه.

٣- المصبر: واته ئه‌و كه‌سه‌ی زۆر له خۆی ده‌كات تا ئارامگر بێت.

٤- الصبور: واته ئه‌و كه‌سه‌یه كه خاوه‌نی ئارامگریه‌كی مه‌زنه و ئارامگری له شێوه وچۆنایه‌تیدا له كه‌سانی تر زیاتره.

٥- الصّبار: واته ئه‌و كه‌سه‌یه به‌رده‌وام ئارمگره، له چه‌ندایه‌تیدا ئارامگری له كه‌سانی تر زیاتره.

وه‌وتراوه ئارامگرتن سێ جۆره: (أن الصبر: هو التسليم والرضى بنزول المصائب والبلوى وتوطين النفوس عليها قبل حلولها. والتصبر: تجرّع مرارتها عند نزولها ومجاهدة النفس على هدوئها وسكونها. والاصطبار: استقبال ما ينزل منها من المصائب والبلوى بالطلاقة والبشر وإنتظار ما لم ينزل منها بالاعتبار والتفكر)(٨).

١- الصبر: واته ئه‌ویش گه‌ردن كه‌چی و ڕازی بوونه به به‌لاو موسیبه‌ت و ڕاهێنانی نه‌فسه له‌سه‌ری، پێش ئه‌وه‌ی توشی ببێت.

---

(٧) انظر:(مدارج السالكين)(٢/ ١٦٥) و(بصائر ذوي التمييز)(٣/٣٧٨)، (مختار الصحاح)(١٤٩).

(٨) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (١٤٩).

٢- التصبر: واتە: نۆشینی ناڕەحەتی ئارامگریە لە کاتی هاتنیدا و تێکۆشانە لەگەڵ نەفسدا تا بێ دەنگ و هێمن بێت.

٣- الأصطبار: پێشوازی کردنی ناڕەحەتی و بەلا بەبزە و ڕوخۆشییەوە، وەچاوەڕوان بوونی ئەوەی کەتوشی نەبووە لە بەڵاو موسیبەت بە چاوێکی گەشبینی و تیّ ڕوانینەوە).

پێویستە بزانین کە ئارامگرتن لە تایبەتمەندیەکانی مرۆڤە، وە ئەم ئارامگرتنە هیچ چاوەڕوان ناکرێت لە گیانلەبەران لەبەر ناتەواوییان، وە زاڵ بوونی ئارەزووەکان بەسەر گیانلەبەران بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەرامبەری بوەستێت.

وەهەروەها ئارامگرتن لە مەلائیکەت چاوەڕوان ناکرێت چونکە ئەوان کامڵ و تەواون لەهەموو ڕویەکەوە و...... ئەوان هیچ ئارەزوویەکی خراپ زاڵ نەکراوە بەسەریاندا تا لایان دات لە ئامادەبوونیان لە خزمەتی خوای پەروەردگاریان تا پێویستیان بەدژایەتی و بەگژا چوونەوەی ئەو هۆکارانە بێت کە دووریان دەخاتەوە لە ئامادە بوونیان لای خوای گەورە و میهرەبان بەڵام مرۆڤەکان لەکاتی منداڵیان بەناتەواوی دروست بوون وەك گیانلەبەران، وەهیچ شتێکیان تێدا دروست نەبووە جگە لەئارەزووی خواردەمەنی کە ئەو پێویستی پێیەتی، لەدوایدا ئارەزووی گەمەو گاڵتەو خۆجوانی تێیدا دێتە دی، وەلە دواتردا ئارەزووی هاوسەرگیری، وە هێشتا هێزی ئارامگرتنی تێدانیە، هەر کاتێك و ژیری مرۆڤ جموجۆڵی کرد و بەهێز بوو، ئەو کات بنەمای پرشنگی ڕێ نیشاندەر گەشە دەکات لەسەرخۆ تاوەکو تەمەنی باڵغ بوون وەك دەرکەوتنی ڕۆشنایی بەیانی تاوەکو هەڵدێ پانتایی ڕۆژ، بەڵام ڕێ نمونیەکەی ناتەواوە و ڕێ نیشاندەرێکی نی یە بۆ وە دەست هێنانی بەرژەوەندیەکانی دواڕۆژ هەر کاتێك ئەو کەسە پەیوەست بوو بە ناسینی شەرعەوە ئەوشتەی پەیوەستە بە دواڕۆژەوە تێیدا پرشنگدارتر دەبێت، بەڵام

سروشتی مرۆڤ واده‌كات ئه‌وشته‌ی خۆش بوێت كه خۆی ئاره‌زووی ده‌كات به‌لاّم داواكاری شه‌رع و عه‌قلّ قه‌ده‌غه‌ی ده‌كات وه‌جه‌نگیش له‌نێوانیاندا هه‌لّگیرساو و ئالّۆزه هه‌میشه، وه‌پێگه و شوێنی ئه‌و جه‌نگه‌ش دلّی به‌نده‌یه، ئارامگریش بریتیه له: جێ گیربوونی هۆكاره‌كانی ئاین له‌به‌رامبه‌ر هۆكاره‌كانی ئاره‌زووه‌كان، وه‌ئه‌گه‌ر ئارامگری جێگیر بێت تا زالّ بێت به‌سه‌ر ئاره‌زووه‌كاندا، ئه‌وكات ئه‌و كه‌سه له‌ڕیزی ئارامگراندا ده‌بێت، وه‌ئه‌گه‌ر ئارامگریه‌كه‌ی لاواز بوو تاوه‌كو ئاره‌زوو زالّ بوو به‌سه‌ریدا و خۆگرنه‌بوو له دوورخستنه‌وه‌ی له خۆی ئه‌وكات ئه‌و كه‌سه ده‌بێت به‌شوێن كه‌وته‌ی شه‌یتانه‌كان، كه‌واته: ئارامگرتن بریتیه له: جێگیربوونی هاندانی ئاین له‌به‌رامبه‌ر ئاره‌زوه‌كان، تا ئه‌م ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه و كێ به‌ركێ كردنه له تایبه‌تمه‌ندیه‌كانی ئاده‌میزاده [٩].

وه فه‌یرۆز ئابادی سه‌باره‌ت به‌هه‌مان باسی واته: پله‌كانی ئارامگرتن ده‌لّێت: "وربما خولف بين أسمائه (أي الصبر) بحسب اختلاف مواقعه، فان كان لنفس المصيبة سُـميَ (صبراً)، وان كان في محاربة سمي (شجاعة)، وان كان في امساك الكلام سُمي (كِتمانـاً)وان كان عن فضولِ العيشِ سُمي (زهُداً)، وان كان عن شهوة الفَرجِ سُـمَي (عِفـةَ)، وان كـان عـن شـهوة طعـامِ سُمِّـي (شـرف الـنفس)، وان كـان عـن اجابـة داعـي الغَضـبِ سُـمَي (حِلماً)"[١٠]. (هه‌ندێك جار جیاوازی هه‌یه له نێوان ناوه‌كانی ئارامگرتن به‌گوێره‌ی شوێنه‌كانی، ئه‌گه‌ر ئه‌و ئارامگریه به‌كار هێنرا بۆ به‌لاّو موسیبه‌ت ناوده‌برێت به ئارامگرتن، وه‌ئه‌گه‌ر به‌كارهێنرا بۆ شه‌ڕ ناو ده‌برێت به ئازایه‌تی، وه‌ئه‌گه‌ر به‌كارهێنرا بۆ گرتنه‌وه‌ی وته ناوده‌برێت به په‌نهانی، وه‌ئه‌گه‌ر به‌كارهێنرا بۆ خۆشی ژیان ناوده‌برێت به پارێزگاری، وه‌ئه‌گه‌ر به‌كارهێنرا له‌ئاره‌زووه‌كانی

---

(٩) انظر: (مختصر منهاج القاصدين) (ص: ٢٦٨ —٢٦٩).

(١٠) انظر: (القاموس المحيط) (٣٧٦/٢).

ڕەگەزی ناودەبرێت بە داوێن پاکی، وەئەگەر بەکارهێنرا لەئارەزووەکانی خواردن ناودەبرێت بە نەفس بەرزی، وەئەگەر بەکارهێنرا بۆ بەربەستی توڕەبوون ئەو کات ناو دەبرێت بەلەسەر خۆیی).

ئارامگر کۆکەرەوەی گشت کردارێکی چاکەیە، ئەمەش پێویستە بۆ بەندە لەگشت کات و ساتێکدا، چونکە مرۆڤەکان هەمیشە بەلاَ و موسیبەتەکان لەڕێگەیاندایە، لەبەر ئەوەشە هەمیشە و هەردەم پێویستیان بەئارامگرتن هەیە، ئەویش کە بنچینەی باوەڕە چونکە باوەڕ دوو بەشە بەشێکی سوپاس کردنە و بەشێکی تری ئارامگرتنە، وەبەسە بۆ ئارامگرتن فەزلّ و گەورەیی، هەر کاتێك بووە هاوڕێی بەلاَ و موسیبەت دەیگۆڕێت بۆ نیعمەت و تاقیکردنەوە وزانست و بەرچاوڕوونی، هەرکات بەجوانی ئارامگربێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ﴾ (المعارج: ٥). هەر کاتێك ئارامگرتنی مرۆڤ ئارامگرتنێکی جوان بوو شایستەی ئەوەیە پاداشتێکی بێ شوماری بدرێتەوە هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ (الزمر: ١٠).

وەهەر کاتێك لە مرۆڤدا ئارامگرتن نەهاتە دی پێویستە لەسەری زۆر بکات لە خۆی تاوەکو ئارامگرتنەکەی بۆ بگەڕێتەوە و خوای گەورەش بە وە فەرمانمان پێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ٢٠٠). (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆڕاگربن، وە لە خۆڕاگرتنیشدا پێشەنگ بن وە پەیوەست بن و لە خوا ترس بن بەڵکو خوا سەرکەوتووتان بکات).

ئیبن قەیم (رحمه الله) له لێکدانەوەی ئەم ئایەتـەدا باسـی لـە پلـەکانی ئـارامگرتن دەکات و دەفەرموێت: "أمرهم بالصبر، وهو حـال الصـابر في نفسـه، والمصـابرة مقاومـة الخصم في ميدان الصبر، فانها مفاعلة تستدعي وقوعها بين اثنين كالمشـاتمة والمضـاربة وهـي اذن حال المؤمن في الصبر مع خصمه، اما المرابطة فهي الثبات واللزوم والاقامة على الصـبر والمصابرة، فقد يصبر العبد ولايصابر، وقد يصابر ولا يرابط، وقد يصـبر ويصـابر و يـرابط من غير تعبد بالتقوى فاخبرهم سـبحانه وتعـالى ان مـلاك ذلـك كلـه التقـوى وان الفـلاح موقـوف عليهـا فقـال (وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ)"[١١]. "خـوای گـەورە فـەرمانی کـردووە بەبەنـدەکانی ئـارامگربن، ئەمـەش حـاڵی ئارامگرانـە لەنەفسـی خۆیانـدا، (والمصابرة) واتە: ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا لەمەیدانی ئارامگرتندا، ئەمەش کاردانەوەیەکە وا دەخوازێ کە ببێت لە نێوان دوو کەسـدا وەك جـوێن دان و لێدانی یەکتری، ئەمـەش حـاڵی ئیمانـداران و باوەڕدارانـە لـە ئارامگرتنـدا لەگـەڵ هاودژەکانیاندا.

بەڵام (المرابطة) واتە: خۆگری و پابەند بوون و بـەردەوامی لەسـەر ئـارامگرتن و خۆڕاهێنان لەسەر ئارامگرتن هەندێ جار بەندە ئـارام دەگرێـت بـۆ کـاتێکی کـەم و زۆر لـە خـۆی ناکـات تـا بـەردەوام بێـت لەسـەر ئـەو ئارامگریـە وە هەنـدێ بەنـدە بـەردەوام دەبێـت لەسـەر ئـارامگری بـەڵام لـە سـەنگەری ئارامگریـدا نامێنێتـەوە، هەندێ جار ئارامگر و خۆڕاگر و دان بەخۆداگر دەبێت بێ ئـەوەی خوانـاس بێـت و پارێزگـارو لـەخواترس بێـت. خـوای گـەورە هـەواڵمان پـێ دەدات و دەفـەرموێت بەڕاستی چاوگ و جڵەوی گشت ئەمانە تەقواو خواناسی یە، ڕزگاری مرۆڤیش هـەر

---

(١١) انظر: (تفسير القيم) (ص:٢١٧).

پەیوەستە بەتەقوا و خواناسی یەوە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)(لە خوابترسن بۆ ئەوەی سەرفرازبن)".

ئارامگرتن دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ قەزاو و قەدەر هەروەك یەحیای کوڕی یەمان ﷺ دەفەرموێت: "الصبر الاّتتمنى حالة سوى ما رزقك الله، والرضا بما قضى الله مِن أمر دنياك وأخرتك"[١٢]. "ئارامگرتن: بریتییە لەوەی ئاواتە خوازی هیچ شتێك نەبێت جگە لەوەی خوای گەورە پێی بەخشیویت لەڕزق و ڕۆزی، وەڕازی بوون بەوەی خوای گەورە بۆ تۆی دیاری کردووە لە دونیا و قیامەتدا".

وەئیبن تەیمییە (رحمه الله): "لەبارەی جۆرەکانی خەڵکی لە ئارامگرتندا دەفەرموێت: خەڵکی لە تەقوادا کە گوێ ڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی ئاینە و ئارامگرتنە لەسەر ئەوەی کە بۆی دیاری کراوە لە ئەندازەی بوونەوەردا خەڵکان لەوەدا چوار بەشن:

١- خاوەن تەقواو ئارامگرتن: ئەمەش ئەوانەن کەخوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندوە بەسەریاندا لە گرۆی بەختەوەراندا لە دونیا و قیامەتدا.

٢- ئەوانەن کە جۆرێك لە تەقواو خواناسیان هەیە بەڵام بەبێ ئارامگرتن:

وەك ئەوانەی کە نوێژ و خواناسی و ئەرکەکانی تری ئاین جێ بەجێ دەکەن، و خۆیان لەقەدەغە کراوەکان دەپارێزن بەڵام کاتێك یەکێکیان توشی موسیبەت و نەخۆشی و وێنەی ئەوانە بن یان توشی زەرەر و زیان بن لەماڵ و سەروەتیان یان شەرەف و ناموسیان، زۆر دەتۆقێن و ناڕەحەت دەبن و زۆر بەناشرینی دەری دەبڕن.

---

(١٢) انظر: (الجامع لإحكام القرآن) للإمام القرطبي (١/٤١٥).

٣- ئەوانەن کە جۆرێك لەئارامگرتنیان هەیە بەڵام تەقوایان نی یە:

نمونەی ئەو تاوانکارانەی کە ئارامگرن لەسەر ئەوەی توشیان دەبێت لەسەر بەئەنجام گەیاندنی تاوان و ئارەزووەکانیان وەك ئەو چەتە و دز و ڕێ گرانەی کە ئارام دەگرن لە سەر ئەو ئێش و ئازارانەی توشیان دێت لە پێناو بەدەست خستنی سامان و بردنی ماڵی حەرام.

٤- ئەمەش خراپترینی بەشەکانە: ئەوانەن کە تەقوای خواناکەن کاتێ دەتوانن وەئارامیش ناگرن کاتێك گیرۆدە دەبن، ئا ئەمانە خراپترین و زاڵمترین و سەرکەش ترین و ستەمکارترین کەسانێکن کاتێك دەسەڵاتیان هەبێت، وەسوك ترین وکەساس ترین کەسانێکن کاتێك بێ دەسەڵات بن.

## مەرجەکانی ئارامگرتن

### ١- نیەت پاکی ئارامگرتن تەنها لەپێناوی خوادا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴾ (المدثر: ٧) (تەنها لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگارت خۆڕاگربە)، وە دووبارە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ إِنَّمَا... ﴾ (الرعد: ٢٢) (ئەوانەی کە ئارام دەگرن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاریان...). وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((انما الاعمال بالنيات وانما لكل امريء ما نوى....)). ((گشت کردارێك پەیوەستە بە نیەتەوە، وەگشت ئادەمیزادێك بە گوێرەی نیەتەکەیان پاداشتیان دەدرێتەوە...)).

سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ فەرموویەتی: ((الصبر في المصائب هو إعتراف النفس لله لما أصاب العبد وإحتسابه عند الله رجاء ثوابه، فذلك الصبر الذي يثيب عليه الاجر العظيم، وإنك لتجد الرجل صبوراً عند المصيبة جليداً وليس بمحتسب لها ولاراجٍ لثوابها

فإذا تفكرت في صبر المصائب وجب صبران أحدهما لله والآخر خليقة تكون في الانسان، وأما جزع المصيبة فهذا لايحتسبها العبد عند الله ولايرجوا ثوابها ويرى أنه سوءٌ أصابه فذلك الجزع ويفعل ذلك وهو متجلد لايتبين منه إلا الصبر))[١٣]. ((ئارامگرتن له به‌لاو موسیبه‌ت دا بریتیه له‌دان پێدانانی نه‌فس بۆ خوای په‌روه‌ردگار سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه توشی به‌نده‌ی كردووه، و به‌هیوا و چاوه‌ڕوانی پاداشته لای خوای په‌روه‌ردگار، ئه‌وه ئه‌و ئارامگرتنه‌یه كه مرۆڤ پاداشتێكی زۆر گه‌وره‌ی له‌سه‌ر ده‌درێته‌وه، به‌ڕاستی تۆ جاری واهه‌یه پیاوێكی ئارامگر ده‌بینی له‌كاتی به‌لاو موسیبه‌ت دا به‌لاّم به‌هیوا و چاوه‌ڕوانی پاداشت نیه لای خوای گه‌وره، هه‌ر كاتێك وردبوویته‌وه له ئارامگرتن له‌سه‌ر به‌لاّوموسیبه‌ته‌كان پێویستت به دوو ئارامگرتنه یه‌كێكیان له‌به‌ر خودایه و دووه‌هه‌میشیان به‌هۆی ئه‌و ڕه‌وشته‌یه كه له‌مرۆڤدا هه‌یه، به‌لاّم ناڕه‌حه‌تی موسیبه‌ت ئه‌وه‌یه‌كه به‌نده تۆماری ناكات به‌كاری چاكه لای خوای په‌روه‌ردگاره وه ئومێدی پاداشته‌كه‌شی ناكات و واده‌زانێت، كه خراپه‌یه‌كه تاوانێكه توشی بووه و واش ده‌كات كه‌ته‌نها ئارامگری پێوه دیار بێت)).

وه هه‌ر سه‌باره‌ت به‌م باسه ئه‌بو مه‌یمون ﷺ ده‌فه‌رموێت: "إن من شروط الصبر أن تعرف كيف تصبر ولمن تصبر وما تريد بصبرك وتحتسب في ذلك وتحسن النية في ذلك لعلك أن يخلص لك صبرك"[١٤]. "واته له‌مه‌رجه‌كانی ئارامگرتن ئه‌وه‌یه كه بزانیت چۆن ئارام ده‌گریت وه بۆ كێ ئارام ده‌گریت وه مه‌به‌ستت چی یه له ئارامگرتنه‌كه‌ت و به‌هیوای پاداشتی خوا ببیت ونیه‌تت زۆر باش بێت له‌وبواره‌دا به‌لّكو ئارامگرتنه‌كه‌ت به‌پاكی بێت".

(١٣) انظر: (الصبر) لابن أبي الدنيا رقم (١٨٨).
(١٤) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا(٦٢).

**٢- نه‌بوونی ناڕه‌زایی و سكالآكردن:**

واته زوبانت بگریت له ناڕه‌زایی. بیشری كوڕی حارس (رحمه الله) ده‌ڵێت: "الصبر الجميل الذي لا شكوى فيه الى الناس"[١٥]. "ئارامگرتنی جوان ئه‌وه‌یه ناڕه‌زایی وسكالآی تێدا نه‌بێت لای خه‌ڵكی". پیاو چاك (ريم بن يزيد المقرىء) ده‌فه‌رموێت: "الصبر ترك الشكوى"[١٦] . (ئارامگرتن وازهێنانه له سكالآكردن)

وه‌ئیبن ته‌یمیه (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: "...والإنسان لابد له من حصول ما يحتاج إليه من رزق ونحوه ودفع ما يضره وكلا الأمرين شرع له أن يكون دعاؤه لله فله ان يسال الله واليه يشتكي كما قال يعقوب عليه السلام: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ (يوسف: ٨٦)، والله تعالى ذكر في القرآن الهجر الجميل والصفح الجميل والصبر الجميل وقد قيل: أن الهجر الجميل هو الهجر بلا أذى: والصفح الجميل صفح بلا معاتبة: والصبر الجميل صبر بغير شكوى الى المخلوق ولهذا قُريء على احمد بن حنبل في مرضه: أن طاووساً كان يكره أنين المرض ويقول انه شكوى فما أنَّ احمد حتى مات. وأما الشكوى الى الخالق فلا تُنافي الصبر فان يعقوب ﷺ قال: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾(يوسف: ٨٣) ، وقال ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ وكان عمر بن الخطاب ﷺ يقرأ في الفجر بسورة يونس ويوسف والنحل فمرَّ بهذه الآية في قراءته فبكى حتى سُمِعَ نشيجه من آخر الصفوف"[١٧]. "ئاده‌میزاد پێویسته ئه‌وشتانه‌ی كه پێویستی پێیه‌تی به‌ده‌ستی بێنێ له‌ڕزق و ڕۆزی و هاوێنه‌ی ئه‌وانه و پێویسته ئه‌و شتانه‌ی كه زیانی هه‌یه بۆی

---

(١٥) اخرجه: ابو نعيم في (الحلية) (٣٥٠/٨) ، والحافظ ابو الفضل الاصبهاني في (سير السلف الصالحين) (١٠٨٢/٣).والبيهقي (شعب الايمان) (٩٦٠٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٦) أخرجه: البيهقي (شعب الايمان) (٩٦٠٧) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٧) انظر:(العبادة وحقيقة العبودية)(ص: ٣٣)، وانظر (مسائل في الزهد والتقوى)(ص: ٣٢ –٣٣).

لـە خـۆی دوور بخاتـەوە لەبـە دەسـت هێنـانی ئـەو دوو کـارەدا وا پێویسـتە کـە داواکردنی هەر لەخوا بێـت، وە تـەنها سکالأکەشـی هـەر لای ئـەو بکـات. هـەروەك یەعقوب عليه السلام فەرمووی: سکالأی غەم و پەژارەی خۆم هـەر لای خوادەکـەم خـوای گەوەر باسی وازهێنان وچاوپۆشی و ئارامگرتنی جوان دەکات، وتـراوە واز هێنـانی جـوان:بریتیـە لـە واز هێنـان بـەبێ ئەزیەتـدان، وەچـاو پۆشـی جـوان؛ بریتیـە لـە چاوپۆشی یەك هیچ ڕەخنە و لۆمەیەکی تیادا نەبێت، وەئارامگرتنی جـوان؛ بریتیـە لـە ئارامگرتنێك کـە هـیچ سـکالأ و نـاڕەزایی یـەکی تێیـدا نـەبێت بـۆ لای دروسـت کراوەکان، ئیمام ئەحمدی کوڕی حەنبەل (رحمه الله) لـە کـاتی نەخۆشـیەکەیدا بـۆی خوێندرایەوە کە تاوس بەلایەوە ناخۆش بووە گریان ونوکەی نـەخۆش وە دەیـوت ئەمە سکالأ و نـاڕەزایی یـە ئیمـام أحمـدیش تـا گیـانی لەدەسـتدا و مـرد گریـان و نوکەی لەکاتی نەخۆشیەکەیدا نەکرد، بەلأم سکالأ بۆ لای پەروەردگار هیچ دژایەتی ئـارامگرتن نـی یـە و دروسـتە. یـەعقوب عليه السلام فـەرمووی: (ئـارامگرتنێکی جـوانم دەبێت، وە (من سکالأی و پەژارەی خـۆم تـەنها بـۆ لای خـوا دەبـەم). وە عومـەر کوڕی خەطاب رضي الله عنه لە نوێژی بەیانیدا سورەتی یونس و یوسف و نـەحلی دەخوێنـد هەرکاتێك بگەیشتایەتە ئەم ئایەتە دەگریا تـا وەکـو لـە کۆتـایی ڕیـز و سـەفەکەدا گوێیان لێ دەبوو.

وەئەعمەش (رحمه الله) دەلێت: "مثل الذي يشكو إلى أخيه كمثل الذي يغسـل إحـدى يد يه بالأخرى"[١٨]. "نمونەی ئەو کەسەی کە سکالأ دەباتە لای برای خۆی وەك ئـەو کەسە وایە کە دەستێکی بە دەستەکەی تری بشوات".

---

(١٨) انظر: (الزهد) لابن مبارك برقم (٨٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت:﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ﴾ (المعارج: ٥).. (أي صبر بلا جزع ولاأذى ولا شكوى، قيل للقمان الحكيم: (اي الناس أصبر؟ قال: صبرٌ لايتبعه أذى)[١٩].

"مانای ئایه‌ته‌كه ئه‌وه‌یه ئارامگربێت به‌بێ سكالاّ و ئازار، وترا به لوقمانی حه‌كیم: چ كه سێك له ناو خه‌ڵكیدا زۆر خۆڕاگرو ئارامگره؟ فه‌رمووی ئه‌و كه‌سه‌یه ئارامگرتنه‌كه‌ی ئه‌شكه‌نجه و ئازاری به‌دواوه نه‌یه‌ت".

وه‌شیخ عه‌بدول قادری گه‌یلانی (رحمه الله) ده‌ڵێت: "ليكن الله مُعلِمَك ومؤْنسك ومحل شكواك فإن الناسَ لا ينفعونك ولا يضرونك ولا يعطونك ولا يمَنعونكَ"[٢٠]. "ته‌نها هه‌ر با خوا مامۆستا و هاوده‌م و جێگه‌ی سكالاّت بێت چونكه ئاده‌میزاده‌كان سود وزیانت پێ ناگه‌یه‌نن وه‌هیچت پێ نابه‌خشن و هیچت لێ قه‌ده‌غه ناكه‌ن".

وه ئیبن قه‌یمی جه‌وزی (رحمه الله) ده‌ڵێت: "إن الشكوى الى الله عز وجل لا تنافي الصبر، وانما ينا في الصبر شكوى الله الى المخلوقين، كما رأى بعضهم رجلاً يشكو الى آخر فاقة فقال: يا هذا تشكو من يرحمك الى من لا يرحمك"[٢١]. " سكالاّ بردنه لای خوای په‌روه‌دگار پێچه‌وانه‌ی ئارامگرتن نی یه، كاتێك پێچه‌وانه‌ی ئارامگرتن ده‌كات كه سكالاّی خوای په‌روه‌ردگار بۆ لای به‌نده‌كانی خوا ببات، وه‌ك بینرا كه‌سێك سكالاّی نه‌بوونی لای كه‌سێكی تر ده‌كرد و ئه‌ویش پێی وت: تۆ سكالاّ له كه‌سێك ده‌كه‌یت كه به‌به‌زه‌ییه بۆت لای كه‌سێك كه بێ به‌زه‌ییه به‌رامبه‌رت، له‌به‌ر ئه‌مه‌شه

---

(١٩) انظر: كتاب(الصر) لبن أبي الدنيا برقم(١٩٤).

(٢٠) انظر: (حلية الأولياء) (٤/١٥٠).

(٢١) انظر: (تهذيب مدارج السالكين) (ص: ٣٥٦) ، وفي رواية (ان سفيان الثوري (رحمه الله) راى رجلا عند قوم يشكو ضيقه، فقال له ياهذا شكوت من ير حمك الى من لا يرحمك) وانظره في: (تاريخ دمشق) لابن عساكر (١٤/٢٦٨) ، و (المجالسة) للدينوري (١٣١٨)، و(شعب الايمان) للبيهقي (٩٦٠٢) وقال محققه: اسناده حسن.

بەرزترین جۆرەکانی ئارامگرتن ئارامگرتنێکە کە شکایەتی بۆلای بەندەکانی خوای تێدا نەبێت کە بە ئارامگرتنی جوان ناو براوە".

هەروەها ئیبن و قەیم (رحمه الله) دەفەرموێت: (نەزان سکالا لە خوا دەکات لای بەندەکانی ئەمەش ئەو پەڕی نەزانینە بەرامبەر سکالا لێکراو سکالا لاکراو، چونکە ئەو کەسە گەر خوای پەروەردگاری بناسیایە سکالای لێ نەدەکرد وە ئەگەر ئادەمیزادەکانی بناسیایە بەهیچ شێوەیەك سکالای بۆلا نەدەبردن، وەهەندێك لە پێشینان کەسێکیان بینی سکالای نەبوونی خۆی بردبووە لای کەسێك و باسی پێویستی یەکانی خۆی لادەکرد، ئەویش وتی: ئەی ئەو کەسەی سکالات کرد لە کەسێك کە ڕەحم و بەزەیت پێ دەکات بۆ لەلای کەسێك کەڕەحم و بەزەیت پێ ناکات.

خواناس ئەو کەسەیە کەتەنها سکالای خۆی لای خوا دەکات، وە لەویش خواناس تر ئەو کەسەیە کە سکالا لە نەفسی خۆی دەکات لای خوا لەو کارانەی کە بوونەتە هۆکاری زاڵبوونی خەڵك بەسەریدا و تەماشای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴾ (الشورى: ٣٠). (هەر بەڵایەکتان توش بوو، هەموو بەهۆی کردەوەی خۆتانەوە بوو، وەلەزۆرێك لە گوناهەکانیشتان بوراوین و لەسەری سزامان نەداون).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴾ (النساء: ٧٩)،(هەر خۆشی و چاکەیەکت توش بوو لە خواوەیەوە و هەر ناخۆشی و خراپەیەکیشت توش بوو لە خۆتەوەیە واتە: بەرهەمی کرداری دەستی خۆتە، خۆت بەخۆتی دەکەیت و ئێمە تۆمان ناردووە بە

پێغەمبەر بۆ تەواوی خەڵکی و خواش بەسە ئاگادار وشایەت بێت بۆ گەیاندنی بەرنامەکەی خوا).

وەدەفەرموێت: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ (آل عمران: ١٦٥)". (ئایا کاتێک بەڵاو ناخۆشیەکتان تووشهات (لە جەنگی ئوحود)دا بۆ دەڵێن: ئەمە چی بوو؟ بۆ وامان بەسەر هات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆهات؟ پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات (کاتێک فەرمانی پێغەمبەرتان شکاند و تەماعی دونیا لە دەروونتاندا جووڵا) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، (بەندە چاکەکانیشی کاتێک هەڵە بکەن تووشی بەڵایان دەکات)...

کەواتە سێ پلەی هەیە: "اخسها ان تشكوا الله الى خلقه، و أعلاها أن تشكوا نفسك أليه، وأوسطها أن تشكوا خلقه أليه"[٢٢]. "بێ نرخ ترینیان ئەوەیە سکاڵا لە خوا بکەیت لای بەندەکان، بەرزترینیان ئەوەیە سکاڵای نەفسی خۆت بۆ لای پەروەردگارت بەریت، وە مام ناوەندیان ئەوەیە کە سکاڵای لە دروست کراوەکان بکەیت لای پەروەردگارت".

**٣- ئارامگرتن لەوساتە وەختەدا پێویستە کە تیایدا توشی بەڵا دەبێت:**

**ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ((...إنما الصبُّر عند الصدمة الأولى))[٢٣]. (ئارامگرتنی ڕاستەقینە لە یەکەم ساتی بیستنی هەواڵی ناخۆش وتووشبوونی بەڵا دەبێت).**

**٤- بەندکردنی نەفس لە ناڕەزایی و ناڕەحەتی دەربرین.**

---

(٢٢) انظر: (الفوائد) لابن القيم (ص: ٨٧ -٨٨).

(٢٣) اخرجه: البخاري (١٣٠٢) ، ومسلم (٩٢٦).

٥- بەنــدکردنی ئەندامــەکان لــەو کردارانــەی کــە دژایــەتی ئــارامگرتن و نارەزایی لە خوای پەروەردگاری تێدا بێت.

٦- دورکەوتنەوە لە پاك ڕاگرتنی نەفس:

سوفیانی سەوری (رحمه الله) دەفەرموێت: "ثلاثٌ من الصبر: الاّ تُحدِثَ بـو جعِـكَ، ولا بمصيبتك ولا تزكي نفسك"[٢٤]. "سێ شت لە ئارامگرتنەوەیـە: بـاس لـە ئـێش و ئازارت نەکەیت، وەبـاس لـە بـەلاّ و موسـیبەتت نەکـەیت، وەنەفسـی خـۆت بـەپاك نەزانیت".

٧-دوورکەوتنەوە لە پەلەکردن وتوڕەبوون و بێ ئومێدی.

## بەشەکانی ئارامگرتن بە گوێرەی پەیوەندی یەکانی

ئارامگرتن بە گوێرەی پەیوەندی یەکانی سێ بەشە:

١- ئـارامگرتن لەســەر فــەرزەکانی خـوای گــەورە و ون نــەکردنیان و بـەجێ گەیاندنیان.

٢- ئارامگرتن لەسەر خۆدوور خستنەوە لـە قەدەغـەکراوەکانی خـوای گـەوەر؛ ئارامگرتن لەسەر گوناه و تاوان و و سەرپێچی یەکان و ڕێگە پێنەدراوەکان.

٣- ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەری خـوای گـەوەر و میهرەبـان و ڕازی بـوون پێیان ئەمەش پێویستە نارازی نەبێت وباوەڕت پـێی هـەبێت وەهـەر کەسـێك ئـەم سێ بەشەی تێدا بێتە دی ئەو کەسـە لـە ڕووی ئارامگرتنـەوە کامـڵ و تـەواوە، وە خۆشی دونیا و قیامـەتی بەدەسـت هێنـاوە وهـیچ کەسـێکیش پـێی ناگـات تـەنها لەڕێگە و پردی ئارامگرتنەوە دەیگاتێ، هەر وەك چۆن هەموو کەسێك لـە ڕێگـەی پردی سیراتەوە دەگاتە بەهەشت.

---

(٢٤) انظر: (تفسير القران العظيم) لابن كثير (٣/٤٨٩).

عمر ی کوڕی خەطاب ﷺ دەفەرموێت: "خير عيش أدر كناه بالصبر ولو أن الصبر كان من الرجال كـان كريمـاً" (٢٥) "چاكترين ژيانێك كە پـێ گەيشـتووين بـە هـۆی ئارامگرتنەوە بووه، وه ئەگەر ئارامگرتن له پياوان بوايه ئەوا كەسێكی بەخشـنده دەبوو".

[ئەم سێ جۆرەش كه باسمان كرد هەمان وتەيه كه شێخ عبدالقادری گـەيلانی باسی كردوه له كتێبی (فتوح الغيب)دا: و دەڵێت(بەنـده پێويسـتی بـه فەرمانێكـه جـێ بـەجێ بكات، وه قەدەغەكراوێكـه خـۆی لێ بپارێزێت، وەقـەزاو قەدەرێكـه ئارامگربێت لەسەری](٢٦).

وه ئيمامی حولەيمش (رحمه الله)سەبارەت به بەشەكانی ئارامگرتن دەفەرموێت:

١) ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتی بەجێ گەياندنی عيبادەت و خواناسی
٢) ئارامگرتن لەسەر موسيبەته ناڕەحەته كارەسات ئامێزەكان.
٣) ئارامگرتن لەسەر ئازاری سەرپێچی كاران.
٤) ئارامگرتن لەسەر ئارەزووەكان و دژايەتی كردنی نەفس) (٢٧).

ئيبن و ئەبی دونيا (رحمه الله)دەفەرموێت: "أن الصبر على عشرة وجوه:- الصبر عن المعاصي وعلى الفرائض والشبهات والفقر والاوجاع والمصـائب وعلـى أذى النـاس وعـن

---

(٢٥) انظر: (الصبر) لابن أبي الدنيا (٦)، و(الطب النبـوي) (ص: ٢٥٧) و(عدة الصـابرين) لابـن القيم (ص: ٢٣).

(٢٦) انظر (عدة الصـابرين وذخـيرة الشـاكرين) ص (٢٣) ، وانظـر: (الـدر المنثـور) (١/٦٦) ، و (كنز العمال) (٦٥١٥) ، و(اللالي المنثورة) (٢/٢١٠).

(٢٧) انظر: (شعب الايمان) للامام الحليمي (ص/٢٧٣).

الشهوات وفضول الكلام والصبر على النوافل"[٢٨]. "واتە ئارامگرتن دە جۆرە، ئارامگرتن لەسەر تاوان و گوناه وە لەسەر فەرزەکان و ئارەزووەکان و ئەو شتانەی کە شوبهەی لێ دەکرێت وجێی گومانن، وە ئارامگرتن لەسەر نەداری و هەژاری وە ئێش و ئازارو بەلا و موسیبەت، وەئارامگرتن لەسەر ئەشکەنجەو ئازاری خەڵکی وە لە وتەی زیادە، وە ئارامگرتن لەسەر سوننەت وکارە چاکە زیادەکان".

## جۆرەکانی ئارامگرتن

١- ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوای گەورە بەگشتی:

خوای گەورە و میهربان داوامان لێ دەکات کە ئارامگربین لە بەجێ گەیاندنی فەرمان و ئەرکەکانی سەر شانمان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا﴾ (مريم: ٦٥). طەبەری دەڵێت: "واتە با نەفست ئارام بگرێت لەسەر جێ بەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆ دوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان وە گوێ ڕایەڵی پەروەردگار، پێویستە لەسەر موسوڵمان بەندایەتی و عیبادەتی خوای پەروەردگار بکات، وە خۆگربێت لەسەر خواناسی بێزارو بێ توانا و ماندوو نەبێت وئارامگربێت وەك ئارامگرتنی هاوەڵ لەگەڵ هاوەڵەکانی خۆی لەکاتی ڕووبەڕووبونەوە و تێکۆشان لە پێناو خوادا".

موغەیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: "كان عَليه الصلاة والسلام يقوم في الليل حتى تَتَوَّرَمُ قَدَماه. وَيقال لَهُ: كَيفَ تَصْنَعُ هذا وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لكَ ما تقدم مِنْ ذَنْبِكَ وما تأخر ؟ فيقول: ((أَفلا أَكون عَبْداً شَكُوراً))"[٢٩]. (پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد و بەپێوە دەوەستا تاوەکو قاچەکانی دەئاوسان، پێی دەوترا چۆن وە بۆچی وا دەکەیت لە کاتێکدا خوای پەروەردگار لە گوناهی

(٢٨) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا(١٥٠).

(٢٩) اخرجه: البخاري (٤٨٣٦)، ومسلم (٧٩) (٢٨١٩).

ڕابردوو لەمەو پێشت خۆش بووە؟ پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئایا نابێت من بەندەیەکی سوپاس گوزاربم).

٢- ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکان:

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ... ﴾ (الرعد: ٢٢). ئیبن و کەثیر دەڵێت: "واتە ئەوانەی ئارامگربوون و خۆیان پاراستووە لە قەدەغە کراوەکان و تاوانەکان لەبەر ڕازیبوونی خوا وپاداشتی نەبڕاوە و هەمیشەییە"[٣٠].

مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت:"الصبر صبران:الصبر على المصيبة حسن وأفضل من ذلك الصبر عن المعاصي"[٣١]. "ئارامگرتن دوو جۆرە: ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتی و موسیبەت کە جوان و گەورەیە وباشتریش لەو ئارامگرتنە لەسەر تاوان و گوناه کردن". هەر لەبەر ئەمەشە (ذا النون) دەفەرموێت: "أفضل الصبر الصبرُ على المخالفات"[٣٢] (باشترین ئارامگرتن. ئارا مگرتنە لەسەر قەدەغەکراوەکان).

بۆ نمونە ئارامگرتن لەسەر چاوداخستن وتەماشانەکردنی نامەحرەم ئەمەش بەڵگەی زۆری لەسەر هەیە لەو بەڵگانە فەرموودەکەی پێغەمبەری خودایە ﷺ کە دەفەرموێت: ((لا تتبع النظرة النظرة، فإنَّما لك الأولى وليست لك الأخرى))[٣٣] (لە دوای تەماشاکردنی یەکەم جار جارێکی تر تەماشا مەکە چونکە یەکەم جار بۆ تۆیە و لەسەر تۆمار ناکرێت بەڵام دووەم جار بۆ تۆ نیە و لەسەرت دەنوسرێت).

(٣٠) (تفسير القرآن الكريم) لابن كثير (٢/ ٥١٠).

(٣١) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (١٨).

(٣٢) أخرجه البيهقي (شعب الايمان) (٩٥٦٧) وقال محققه: اسناده جيّد.

(٣٣) اخرجه:احمد (٥/٣٥١)، أبو داود (٢١٤٩)، الترمذي (٢٧٧٧)، الحاكم (٢/١٩٤)، البيهقي (٧/٩٠) وحسّنه الشيخ الألباني في: (صحيح أبي داود) (١٨٦٥) ، (صحيح الترمذي) (٢٢٢٩) ، (حجاب المرأة) (٣٤).

واتە بەسەیرکردنی یەکەمجارت بۆ ئافرەتی نامەحرەم کە چاوت دەچێتە سەری هیچت لەسەر نانوسرێت بەڵام جاری دووەم گوناه و تاوانت لەسەر دەنوسرێت.

وەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إياكم والجلوس على الطرقات .... قال:غض البصر وكف الأذى ورَّد السَلام))[٣٤]. (ئاگاداری خۆتان بن لەکاتی دانیشتندا لەسەر ڕێگاکان..... وەمافی ڕێگا بدەن. هاوەڵان وتیان: مافی ڕێگا چی یە ؟ فەرمووی: چاوداخستن و تەماشانەکردنی نامەحرەم، وەخۆپاراستن لەو شتانەی ببێتە مایەی ئازاری خەڵکی، وەڵام دانەوەی سەلام کردن).

ئیبن قەیمی جەوزی (رحمه الله) دەفەرموێت: "...النظر أصل عامة الحوادث التي تصيب الإنسان فالنظرة تولد خطرة، ثم تولد الخطرة فكرة، ثم تولد الفكرة شهوة، ثم تولد الشهوة إرادة تقوى فتصير عزيمة جازمة، فيقع الفعل ولابد، ما لم يمنع منه مانع وفي هذا قيل: (الصبر على غض البصر ايسر من الصبر على الم ما بعده". ((سەیر کردنی حەرام و قەدەغەکراو بناغەی گشت ڕووداوەکانە کە توشی مرۆڤ دەبێت سەیرکردنی ناشەرعی کاری ترسناکی لێ دەکەوێتەوە، چونکە تەماشاکردن خەیاڵ دروست دەکات و خەیاڵیش بیرۆکە دروست دەکات و بیرۆکەش ئارەزوو دروست دەکات وئارەزووش ویست و خواستی بەهێز دروست دەکات، وەئەو خواستەش دەبێت بە بڕیارێکی یەکجارەکی ئەوکاتیش کارەکە ئەنجام دەدرێت، گەر ڕێگرێك نەبێت ڕێی ئەنجامدانی ئەو کارەی لێ بگرێت. لەبەر ئەمەشە وتراوە، ئارامگرتن لەسەر چاوداخستن ئاسانترە لەئارامگرتن لەسەر ئێش وئازاری دوای چاوداخستن.

شاعیر دەڵێ:

كل الحوادث مبدأُها من النظر ومعظم النار من مستصغر الشرر

---

(٣٤) اخرجه: البخاري (٦٢٢٩) ، مسلم (٢١٢١) ،أبو داود (٤٨١٥).

(واته: هه‌موو به‌سه‌ر هاته‌کان سه‌ره‌تایان له ته‌ماشاکردنه‌وه‌یه، وه زۆربه‌ی ئاگره‌کان سه‌ره‌تایان له پیزیسکێکه‌وه‌یه).

له زیانه‌کانی سه‌یرکردنی حه‌رام: ئه‌وه‌یه هه‌میشه ئاخ و حه‌سره‌ت و جه‌رگ و دڵ سوتان دروست ده‌کات، مرۆڤ شتی وا ده‌بینێت ناتوانێت ئارام و خۆ ڕاگربێت له‌سه‌ری، ئه‌وه‌ش گه‌وره‌ترین ئه‌شکه‌نجه و ئازاره گه‌ر شتێك ببینیت ونه‌توانیت ئارامگر بیت له‌سه‌ر هه‌ندێکی وتوانا شت نه‌بێت به‌سه‌ر هه‌ندێکی تریدا.

شاعیر ده‌ڵێت:

وكنت متى أرسلت طرفك رائداً ... لقلبك يوماً، أتعبتك المناظر
رأيت الذي لا كله أنت قادر ... عليه، ولا عن بعضه أنت صابر[٣٥]].

(واته: تۆ هه‌ر کات تیله‌ی چاوت کرده نوێنه‌ری دڵت زۆری دیمه‌نه‌کان ماندوت ده‌که‌ن ئه‌و دیمه‌نه ده‌بینیت که توانات نیه به‌سه‌ر هه‌موویدا و ئارامگریش نیت به‌سه‌ر هه‌ندێکدا).

٣- ئارامگرتن له‌سه‌ر نوێژ به‌تایبه‌تی:

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ .. ﴾ (طه: ١٣٢) (فه‌رمان به‌خێزانت بکه نوێژ بکه‌ن و تۆش خۆڕاگر به‌له‌سه‌ری) .

ئیمامی طه‌به‌ری (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: "تۆ خۆ ڕاگربه له‌سه‌ر جێبه‌جێ کردنی نوێژ به هه‌موو سنوره‌کانی یه‌وه"[٣٦]. وه ئیبن که‌ثیریش (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: "تۆ ڕزگاریان بکه له سزای خودا به‌ئه‌نجام دانی نوێژ، وه‌تۆش ئارام و خۆ ڕاگربه له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی نوێژ"[٣٧].

---

(٣٥) انظر: (الجواب الكافي) لابن القيم (ص: ٧٨).

(٣٦) انظر: (تفسير الطبري) (٩/٢٩٣).

(٣٧) انظر: (تفسير القرآن العظيم) لابن كثير (٤/٨٧).

عه‌بدوللای كوڕی سه‌لام ﷺ ده‌فه‌رموێت: ((كان النبي ﷺ إذا نزل بأهله الضيق أمرهم بالصلاة ثم تلا (﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا .. ﴾))(٣٨). پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌ركاتێك ته‌نگی و ناڕه‌حه‌تی یه‌ك بكه‌وتایه‌ته ناو ماڵ و منداڵی فرمانی پێ ده‌كردن به نوێژكردن له پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی بۆ ده‌خوێندنه‌وه (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ) فه‌رمان بده به هه‌موو تاكه‌كانی خێزانت، تا نوێژه‌كانیان (به‌چاكی ئه‌نجام بده‌ن، چونكه خۆراكی ڕۆحه) و به‌رده‌وام و كۆڵنه‌ده‌ر و خۆڕاگربه له‌سه‌ری، ئێمه بێگومان داوای ڕزق و ڕۆزی له تۆ ناكه‌ین، به‌ڵكو ئێمه ڕزق و ڕۆزی به تۆ ده‌به‌خشین، سه‌ره‌نجامی چاك هه‌ر بۆ خواناسی و دینداریه).

وه‌پێشه‌وا عومه‌ری كوڕی خه‌طاب ﷺ هه‌ركاتێك شه‌و نوێژی بكردایه كاتێك لێده‌بوویه‌وه ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا .. ﴾ وعوڕوه ﷺ كاتێك شتێكی ببینیایه له دونیا ده‌هاته‌وه بۆلای ماڵ و منداڵی و ده‌یوت نوێژ نوێژ له پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا .. ﴾(٣٩).

وه به‌كری كوڕی عه‌بدوللای مه‌زه‌نی (رحمه الله) هه‌ركاتێك ماڵ و منداڵی شتێكی تایبه‌تی توش بوایه ده‌یفه‌رموو: "قوموا فصلوا ثم يقول: بهذا أمر الله تعالى رسوله ثم قرأ ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا أَسَرَفَ .. ﴾"(٤٠). هه‌ستن نوێژ بكه‌ن، له پاشان ده‌یوت ئابه‌ئه‌مه خوای گه‌وره فه‌رمانی به پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كردووه پاشان ئه‌و ئایه‌ته‌ی ده‌خوێنده‌وه.

---

(٣٨) اخرجه: الطبراني في (الاوسط) رقم (٨٨٦) وقال محققه : اسناده حسن، وقال الهيثمي في (المجمع) (١١١٧٣): رجاله ثقات.

(٣٩) اخرجه: الطبري في (جامع البيان) رقم (١٨٤٥٧-١٨٤٥٨).

(٤٠) انظر: (زاد المسير) لابي الفرج الجوزي (٥/٢٤٨).

**٤- ئارامگرتن لەسەر بانگەشەکردن بۆلای خوای گەورە:**

**خوای گەورە دەفەرمویت:** ﴿ ...وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴾ (العصر: ٣) (ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوەو ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە، خۆگرو ئارامگریش بن) .

**ئیمامی شافعی** (رحمه الله) **دەفەرمویت: "لو ما انزل الله حجة على خلقه إلا هذه السورة لكفتهم"**[٤١]. **"گەر خوای گەورە هیچ سورەتێکی نەناردایەتە خوارەوە جگە لەم سورەتە ئەم سورەتە بەس بوو ببێت بە بەڵگە بەسەر بەندەکانی یەوە.**

**وەخوای گەورە لە چیرۆکی لوقماندا دەفەرمویت:** ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ (لقمان:١٧). **واتە: لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی کردوو وتی:** (کوڕی شیرینم نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە، فەرمان بە چاکە بدە، ڕێگری لە گوناهو خراپە بکەو وە بە ئارامبە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی کە تووشت دەبن، بەڕاستی ئەوانەی کە باسکران هەندێکن لەوانەی هەر دەبێت بکرێن).

**لە عەمری کوڕی حەماشەوە** ﷺ **دەفەرمویت: "انه أوصى ولده فقال:...وإذا أراد أحد كم ان يأمر بالمعروف أو ينهى عن المنكر فليوطن نفسه على الصبر على الأذى"**[٤٢]. **" ئامۆژگاری و وەسیەتی بۆ کوڕەکەی کرد و وتی هەرکاتێك یەکێك لە**

---

(٤١) انظر: (الأصول الثلاثة) (ص: ٣).

(٤٢) أخرجه: الطبراني في (الاوسط) ، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢٦٦/٧): رجاله ثقات.

ئێوە ویستی فرمان بە چاکە بکات یان ڕێگری لە خراپە بکات با نەفسی خۆی ڕابێنێت لەسەر ئارامگرتن لەسەر ئەشکەنجە و ئازار".

نمونەی ئارامگرتن لەسەر بانگەشە بۆ لای خوای گەورە زۆرە لە قورئانی پیرۆزدا، وەك ئارامگرتنی پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێت بە تایبەت (نوح، أبراهیم، موسی، عیسی، هود، أیوب، .... هتد) لەگەڵ پێغەمبەری بەڕێزمان وە ئارامگرتنی هاوەڵان و تابیعیەکان و زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕەزای خوایان لێبێت بەگشتی.

پێغەمبەر نوح ﷺ فەرمووی هەروەك خوای گەورە چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ۝ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِي إِلَّا فِرَارًا ۝ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا ﴾ (نوح: ٥ – ٧). (دوای سەدەها ساڵ بانگەواز نوح سکاڵای کردو وتی: پەروەردگار من بە شەو و بە ڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد (بۆ یەکخواناسی و پارێزکاری). *کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکردن؛ تەنها ڕاکردنیان نەبێت. * بەڕاستی من هەموو جارێك کە بانگم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن، وجلەکانیان بەسەر خۆیاندا دەدا تا نەمبینن، زۆر گەرم بوون لەسەر بێ باوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی و لووت بەرز بوون).

وە خوای گەورە لە سەرزوبانی بێ باوەڕەکان دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ ﴾ (فصلت: ٥).

(وتیشیان : ئێمە دڵەکانمان داپۆشراوە لە ئاستی ئەم بەرنامەیەدا کە تۆ بانگی ئێمە دەکەیت بۆ لای، گوێشمان کەڕو قورسە لە ئاستیدا، وە لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردە و بەربەست هەیە، تۆ هەوڵ و کۆششی خۆت بدە، بێگومان ئێمەش هەوڵ و کۆششی خۆمان دەدەین).

(ئیبن تەیمیە (رحمه الله) دەڵێت: "(من الجهاد): صبر الرسل على أذى المكذبين، لئلا يتركوا ما أمروا به من دعوتهم إلى عبادة الله وحده، وأمرهم بالمعروف ونهيهم عن المنكر فهذا الصبر من جنس الجهاد في سبيل الله، إذا كان الجهاد مقصوداً به: أن تكون كلمة الله هي العليا وان يكون الدين كله لله فالجهاد والصبر فيه من أعظم الأعمال"[٤٣]. " له تێکۆشان له پێناوی خوادا: ئارامگرتنی پێغەمبەران لەسەر ئەشکەنجە و ئازاری ئەوانەی بەدرۆیان دەخستنەوە، تا واز لەو فرمانانە نەهێنن کە فەرمانیان پێ کراوە لە بانگەوازەکەیاندا بۆ پەرستنی خوای گەورە بەتەنها. وەفەرمان کردنیان بەچاکە و ڕێگریان لە خراپە، ئەو ئارامگرتنەیان لە جۆری جیهاد و تێکۆشانە لە لەپێناو خوای گەورەدا، گەر مەبەست لەو تێکۆشانەیان: بەرز بوونەوەی وشەکانی خودا بێت، و هەموو پەرستنێکیش تەنها بۆ خوای گەورە بێت، ئەوکاتە تێکۆشان و ئارامگرتن گەورەترین کردارێکە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات.

بانمونەیەکی ئارامگرتنی پێغەمبەر ﷺ بهێنینەوە لەسەر بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای ئاینی خوای گەورە. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَقد اخفِت في الله وَما يَخاف أحد، وَلَقد أُوذيت في الله وما يُؤذى أحد، ولقد أَتَت عليَّ ثلاثون مِن بين يوم وليلة ومالي ((ولعيالي))[٤٤]، ولبلال طعامٌ يأكلهُ ذو كَبد إلاّ شيء يواريه إبط بلال))[٤٥].

---

(٤٣) انظر: (مجموع الفتاوى) (١٨/١٧).

(٤٤) في رواية الأمام احمد(٣/٢٨٦).

(٤٥) أخرجه:احمد (٣/٢٨٦)، وابن أبي شيبة (١١/٤٦٤) ، والترمذي (٢٤٧٢) وقال:حديث صحيح ، وابن ماجة (١٥١) ، وأبو نعيم في (الحلية الأولياء) (١/١٥٠) ، وابن عساكر (٣/٣٠٨) ، وأبو يعلى (٣٤٢٣) ، وابن حبان (٦٥٦٠) وقال محققه:صحيح على شرط مسلم ،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٢٠١٢) ، وفي (صحيح سنن أبي ماجة) (١٢٣) وفي (صحيح الجامع) (٥٠٠١)، وفي (السلسلة الصحيحة) (٢٢٢٢) ، وفي(المشكاة) (٥٢٥٣)، وفي (مختصر الشمائل) (١١٥) واللفظ للترمذي.

(ترسێنراوم له پێناوی خوادا و هیچ کەسێك بەوێنەی من نەترسێنراوە، وئازار دراوم له پێناوی خوادا و هیچ کەسێك بەوێنەی من ئازار نەدراوە، وسی ڕۆژ و شەو بەسەرمدا تێپەڕیوه و هیچ نەبووه خۆم وخێزانم و بیلال بیخۆین لە وشتەی گیانلەبەرێك بیخوات تەنها ئەوەندەمان هەبووه کە ژێر باڵی بیلال دا بپۆشێت.

ئیبن و مەسعود ﷺ دەفەرموێت: [لما كان يوم حنين، آثر رسولُ الله ﷺ ناساً في القسمة، فأعطى الأقرع بن حابس مائةً من الإبل، وأعطى عُيينة ابن حصن مثل ذلك، واعطى ناساً منْ أشراف العرب وآثرهم يومئذ في القسمة، فقال رجلٌ: واللهِ إن هذه القسمة ما عدل فيها وما أريد فيها وجه الله، فقلت: والله لأخبرنَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم فأخبرته بما قال، فتغيَّر وجهه حتى كان كالصرف، ثم قال: ((يرحم الله موسى قد أوذي بأكثر من هذا فَصبر)). فقلت: لا جرم لا ارفع إليه بعدها حديثاً ][٤٦]. (لە ڕۆژی حونەیندا پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی بەهەندێك خەڵكدا و بەشی زیاتری پێ دان لەدابەش کردنی غەنیمەت و دەستکەوتەکاندا، تا سەد وشتری دا بەئەقرەعی کوڕی حابیس، هەروەها سەد وشتری دا بە عوییەینەی کوڕی حوصن وەهەندێکی تر لە گەورە پیاوانی عەرەب ڕێزی لێ گرتن و بەهەمان شێوە وشتری پێ بەخشین، پیاوێك وتی: وەڵاهی ئەم دابەش کردنە هیچ دادپەروەریەکی تێدانیە و لەبەر خوای پەروەردگار نەبووه، منیش وتم سوێند بە خوا ئەم هەواڵە دەگەیەنم بە پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان هەواڵەکەم پێداو هەواڵم دا پێی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووخساری گۆڕا وەك ڕەنگێکی سور هەڵگەڕا. لە پاشان فەرمووی ڕەحمەتی خوا لە موسا بێت بەڕاستی زیاتر لەمە ئازاریان دا و خۆڕاگر وئارامگریش بوو منیش وتم لەمەودوامنیش هیچ هەواڵێك ناگەیەنمە پێغەمبەری خوا ﷺ).

(٤٦) أخرجه: احمد (٣٨٠/١)، والبخاري (٣٤٧٧)، ومسلم (١٦٠٢).

هەر لە عەبدوللای کوری مەسعودەوە ﷺ فەرمووی: [كأني انظر إلى رسول الله ﷺ يحكي نبياً من الأنبياء –صلوات الله وسلامه عليهم –ضربه قومه فأدَّموه، وهو يمسح الدم عن وجهه وهو يقول ((اللهم إغفر لِقَومي فَإِنَّهُمْ لا يعلمون)) ](٤٧). (وەك ئەوەی سەیری پێغەمبەری خوا بکەم باسی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی بۆ دەکردین سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت قەومەکەی لێیان داو خوێناوییان کرد، ئەویش دەستی دەهێنا بەسەر خوێنەکەیدا ودەیسرِی کەبەدەم وچاوی یەوە بوو دەیوت خوایە لە قەومەکەم خۆش بە بەڕاستی ئەوان نەزانن).

وە لە ئەبو عەبدوللای خەبابی کوڕی ئەرەتەوە ﷺ فەرمووی: [شكونا الى رسول الله ﷺ وهو متو سِّدٌ بردةً له في ظلِ الكعبة فقلنا: ألا تستنصر لنا ؟ ألاتد عولنا ؟ فقال: ((قَد كان من قبلكم يؤخذ الرجل فيُحفر له في الأرض، فَيُجعل فيها ثُم يؤتي بالمنشار، فيوضع على رأسه فيجعل نصفين ويمشط بأمشاط الحد يد ما دون لحمه وعظمه ما يصده ذلك عن دينه، والله لَيُتمَّنَّ الله هذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء الى حضرموت لا يخاف إلا الله والذئب على غنمه ولكنَّكُمْ تَستعجِلون))](٤٨). (سکالامان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە دانیشتبوو لەسەر عەبایەك لە سێبەری کەعبەدا وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت؟ فەرمووی: بەڕاستی لەپێش ئێوەوە پیاویان دەگرت و چاڵیان بۆ هەڵدەکەند لەزەوی و دەیان خستە ناوی و لەپاشان مشاریان دەهێناو لەسەر سەری دایان دەناو دەیان کرد بە دوو کەرتەوە، وە شانەی ئاسنینیان دەهێنا گۆشتی لاشەیان پێ پارچە پارچە دەکرد و ئەوانیش پەشیمان نەدەبوونەوە لە ئاینەکەیان، سوێند بەخوا خوای پەروەردگار ئەم ئاینە کاملْ و تەواو دەکات تاوەکو سوار لە سەنعاوە دەچێت بۆ حەزرەمەوت

(٤٧) اخرجه: البخاري (٣٤٧٧)، واحمد (١/٣٨٠).

(٤٨) أخرجه: البخاري (٦٩٤٣)،أبو داود (٢٦٤٩)، احمد (٥/١٠٩).

جگه له‌خوای گه‌وره وپاشان گورگ بۆسه‌ر مه‌ڕه‌کانی له هیچ که‌سێکی تر ناترسێت به‌ڵام ئێوه په‌له ده‌که‌ن).

**٥- ئارامگرتن له‌سه‌ر نه‌خۆشی و هه‌ژاری:**

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (البقرة: ١٧٧)، فالبأساءُ: الفقر ونحوه، والضّراء: المرضُ،قَالَ تَعَالَى: ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ ... ﴾ (الفرقان: ٧٥) وقال محمد بن علي زين العابدين في تفسير قوله تعالى [الْغُرْفَةَ] قال: الغرفة هي الجنة و(بما صبروا) أي:بما صبروا على الفقر[٤٩].: (ئه‌وانه‌ی که ئارامگربوون له هه‌ژاری و نه‌خۆشی و کاتی جه‌نگدا، ئه‌وانه ڕاستگۆن و هه‌ر ئه‌وانیش خۆپارێزن) وه مه‌به‌ست (البأساء) فه‌قیری و هه‌ژاری و نه‌داری‌یه وه مه‌به‌ست به (الضراء) نه‌خۆشیه وه محمدی کوڕی علی زه‌ینولعابدین له‌مانا و ته‌فسیری فه‌رمایشتی خوای گه‌وره (الغرفة) فه‌رمووی: بریتی له به‌هه‌شت وه مه‌به‌ست له (بما صبروا) واته به‌وه‌ی که خۆڕاگر و ئارامگرن بوون له‌سه‌ر هه‌ژاری و نه‌داری.

* له فاتیمه‌ی خوزاعی یه‌وه (رضي الله عنها) ده‌فه‌رموێت: ((عاد النبي ﷺ امرأة من الأنصار وهي وجعة فقال لها: ((كيف تجدِينكِ))؟ قالت: بخير إلا أن أم ملدم قد برحت بي – يعني الحُمى، فقال النبي ﷺ: (اصبِري ْ فأنها تُذهِبَ خبثَ ابن ادم كما يُذهِبُ الكيرُ خبَثَ الحديد))[٥٠]. (پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ سه‌ردانی ئافره‌تێکی پشتیوانانی(الأنصار)ی

---

(٤٩) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٢٨).

(٥٠) اخرجه: عبد الرزاق في (المصنف) (٢٠٣٠٦) ، والطبراني في (الكبير) (٢٤/(٩٨٤) ، و ابن السني في (عمل اليوم والليلة) (٥٤١)، و البيهقي (الشعب) (٩٨٤٠)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٤٤٠).

ناومەدینەی کرد کە ئێش و ئازاری هەبوو وتی چۆن خۆت دەبینیتەوە؟ وتی بەچاکە بەڵام ئەم شەو توشی تا بووم و نارەحەتی کردم پێغەمبەری خواش پێی فەرموو ئارامگربە لەرز وتا پیسی گوناه وتاوان لەبەرەی ئادەمیزاد لادەبات هەر وەك چۆن ئاگر ژەنگی ئاسن ناهێڵێت ولای بدات).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((جاءت امرأة إلى النبي ﷺ و بها لممٌ..... (فقال لها رسول الله ﷺ: ((إنْ شِئتِ دعوتُ الله أن يشفيكِ، وإن شِئتِ فاصبري ولا حساب عليكِ)) ؟ قالت: بل أصبرُ ولا حساب عليّ)) [٥١].(ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا کەپەرکەم و فێی لەگەڵدا بوو..... پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو ئەگەر حەز دەکەیت داوات بۆ دەکەم تاخوا شیفات بدات وە ئەگەر حەز دەکەیت ئارامگربەو هیچ لێ پرسینەوەیەکت لەگەڵ ناکرێت لە قیامەتدا وتی: بەڵکو ئارام دەگرم تا لێ پرسینەوەم لەگەڵدا نەکرێت.

* عائشە (رضي الله عنها) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاوەقوڵە واتە نەخۆشی (الطاعون) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((انه كان عَذاباً يبعثه الله تعالى على من يشاء فجعله الله تعالى رحمة للمؤمنين فليس مِنْ عَبد يَقعُ في الطاعونِ فيكمث في بلده صابراً مُحْتَسباً يعلم أنهُ لا يصيبه إلاّ ما كتب الله لَـهُ إلا كان له مثل أجر شَهيد)) [٥٢]. (ئەو ئازارە سزایەك بوو خوای گەورە دەیناردە سەر هەر قەومێك کە خۆی ویستی لێ بێت، بەڵام خوای گەورە بۆ ئیمانداراني کردووە بەبەزەیی و هەر بەندەیەك توشی ببێت و لەناو شارەکەی خۆیدا ئارامگربێت و بەهیوای پاداشتی خوابێت وابزانێت

(٥١) أخرجه: أحمد في (المسند) (٩٦٨٩) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن ، وابن حبان (٢٩٠٩).

(٥٢) أخرجه: البخاري (٦٩٧٤)،مسلم (٢٢١٩)،احمد(٦٤/٦)واللفظ له ، البيهقي (٣٧٦/٣) و انظر: (أحكام الجنائز) للألباني (ص: ٥٢).

ئەوەی خودا بۆی نوسیووە هەر ئەوەی توش دێت، ئەو کەسە خوای پەروەردگار بە وێنەی شەهید پاداشتی دەداتەوە.

* جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((الفارُّ [من الطاعون] كالفارِّ من الزحف، [والصابر فيه كالصابر في الزحف] ومن صبر فيه كان له اجر شهيد))(٥٣). (ڕاکردن لە نەخۆشی چاوەقوڵە وەك ڕاکردنە لە تێکڕژانی کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی بێ باوەڕان وە هەرکەسێك ئارامبگر بێت لە سەر نەخۆشی چاوەقوڵە و لەو شوێنە دەرنەچێت وەك ئەو کەسەیە خۆڕاگربێتبەرامبەر هێرشی دوژمنوە ئەو کەسە پاداشتی هاو وێنەی پاداشتی شەهیدە).

* شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إن الله يقول: إذا ابتليت عبداً من عبادي مؤمناً، فحَمد ني وصبر على ما ابتليته بِهِ، فانَّهُ يقومُ مِن مضجعه ذلك كيوم —ولدته أمه مِنْ الخطايا))(٥٤). (خوای گەورە دەفەرموێت: هەرکاتێك بەندەیەك لەبەندە بڕوادارەکانم توشی تاقی کردنەوە و نەخۆشی کرد و ئەو سوپاسی کردم و ئارامی گرت لەسەر ئەوەی پێیەوە گیرۆدە بووە ئەو کەسە کە لەسەر جێگە هەڵدەستێتەوە لە دوای چاك بوونی وەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووە و بێ گوناهە...).

---

(٥٣) اخرجه: احمد (٣/٣٢٤) (رقم: ١٤٤٧٨، ١٤٧٩٣٢) وقال محققه : حسن لغيره، و البزار(٣٣٨)، والطبراني (الأوسط) (٣٢١٧) ، وقال الهيثمي في (المجمع) (٢/٣١٥): رواه احمد ورجاله ثقات.

(٥٤) أخرجه: احمد (٤/١٢٣) ، وابن عساكر في (التاريخ) (٨/٢) ، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٠٠٩).

* ئه‌بو سه‌عید و ئه‌بو هوره‌یره ﷺ ده‌گێڕنه‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ كه فه‌رموویه‌تی: ((ما يُصيب المسلم من نصب و لا وصب (أي: المرض) ولاهم ولا حزن ولا أذى ولا غم حتى الشَّوكة يُشاكها إلاّ كَفَّرَ الله بها من خطاياه))[٥٥]. (موسوڵمان هه‌رشتێكی توش ده‌بێت له ماندوبوون و نه‌خۆشی، غه‌م و خه‌فه‌ت، ئه‌شكه‌نجه و ئازار، هه‌تا دڕكێكیش ده‌چێت به‌شوێنێكیدا خوای گه‌وره ده‌یكاته مایه‌ی سڕینه‌وه‌ی گوناهه‌كانی).

* عه‌بدوللاّی كوڕی عه‌مری كوڕی عاص ﷺ ده‌گێڕێته‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((قَدْ افلحَ من اسلمَ، وكان رزقه كفافاً فصبر عليه))[٥٦] (به‌ڕاستی سه‌رفرازه ئه‌و كه‌سه‌ی كه موسوڵمان بووه و ڕزق و ڕۆزییه‌كه‌ی به‌شی كردووه و ئارامی گرتووه له‌سه‌ری).

ئه‌بو عبدالرحمن حه‌نبه‌لی ده‌فه‌رموێت: (جاء ثلاثة نفر إلى عبدالله بن عمرو بن العاص ﷺ وأنا عنده فقالوا: يا أبا محمد إنّا والله ما نقدر على شيءٍ ولا نفقةٍ ولا دابة ولا متاعٍ ؟ فقال لهم: ما شئتم، إن شئتم رجعتم إلينا فأعطيناكم ما يسَّر الله لكم، وإنْ شئتم ذكرنا أمركم للسلطان، وإن شئتم صبرتم، فإني سمعت رسول الله ﷺ يقول: ((إنَّ الفقراء يسبقون الأغنياء يوم القيامة بأربعين خريفاً))، قالوا: (فانا نصبرُ ولا نسأل شيئاً))[٥٧]. (سێ نه‌فه‌ر هاتنه لای عه‌بدوللاّی كوڕی عه‌مری كوڕی عاص ﷺ من له‌لای بوم وتیان ئه‌ی باوكی محمد وه‌ڵڵاهی توانای هیچ شتێكمان نی یه‌، توانای بژێوی و وڵاخ و كه‌ل و په‌لمان نی یه ؟ ئه‌ویش پێی وتن ئاره‌زووتان له چی یه ؟ گه‌ر ئاره‌زووتان

---

(٥٥) أخرجه: البخاري (٥٦٤١)،ومسلم (٢٥٧٣)وانظر (رياض الصالحين) بتحقيق الشيخ الألباني رقم (٣٨).

(٥٦) اخرجه: ابو نعيم في (الحلية) (١٢٩/٦) ،وابن حبان في (الصحيح) (٦٧٠) وقال محققه: حديث صحيح.

(٥٧) أخرجه: أحمد (٦٥٨٧) ، ومسلم (٢٩٧٩).

لێ بوو بگەڕێنەوە لامان تا پێتانی ببەخشین لەوەی کە خوا بۆمانی ئاسان دەکات، وە گەر ئارەزووشتان لێ یەتی باستان دەگەیەنینە سەر کردە تا یارمەتیتان بدات، وە گەر ئارەزووشتان لێیەتی ئارامگربن چونکە من لە پێغەمبەری خوام بیستووە ﷺ کەئەی فەموو: (هەژارەکان پێش دەوڵەمەندەکان دەکەون لە چوونە بەهەشتدا لەقیامەتدا بەچل پاین) ئەوانیش وتیان ئێمەش ئارام دەگرین و داوای هیچ شتێك ناکەین).

* ئەبو ئومامە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((اغبُط الناس عندي، مؤمن خفيف الحاذ ذو حظِ من صلاةِ، وكان رزقه كفافاً فصبر عليه حتى يلقى الله عز وجل واحسن عبادةُ ربّه وكان غامضاً في الناس [لا يُشار إليه بالأصابعِ] عُجلتِ مَنيته وقل تراثه، وقل بواكيه))(٥٨)، (بەختەوەرترین کەس بەلای منەوە باوەڕدارێکی دەست کورتە خاوەن نوێژە، وەڕزق و ڕۆزی یەکەی بەشی دەکات و ئارامدەگرێت لەسەری تادەگاتەوە بە خوای پەروەردگاری وبەندایەتیەکەی چاك بەجێ دەگەیەنێت وە لەناو خەڵکیدا پەنجەی بۆ ڕاناکێشرێت و ناناسرێت، وە مردنەکەی زوو هاتووەتە پێش لێی ومیراتیەکەشی لە دوای خۆی کەم بوو،و فرمێسك ڕژانیش لەسەری کەم بوو. (ئەمە فەرموودەیەکی لاوازە ئاگادار بە).

* ئیبن مەسعود رضي الله عنه فەرموویەتی: [دخلت على النبي ﷺ وهو يُوعك. فقلت لـه: يا رسول الله إِنَّكَ تُوعك وعكاً شديداً، قال: ((أجل، إني أوعك كما يُوعك رَجلان

(٥٨) أخرجه: احمد (٢٥٢/٥) ، والترمذي (٢٣٤٧) ، وابن ماجة (٤١١٧)، والبيهقي في (الشعب) (١٠٣٥)، و الروياني في (مسند الصحابة) (١٢١٩)، وضعفه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٥١٨٩) ، و (ضعيف الجامع) (١٣٩٧)، و (ضعيف الترغيب) (١٨٦٤)، و(ضعيف الترمذي) (٢٣٤٧)، و(ضعيف ابن ماجة) (٤٩٥٣) وهو حديث ضعيف أوردناه للعلم فقط.

منكم)) قلت: ذلك ان لكَ أجرين؟ قال: ((أجل ذلك كذلك، ما من مسلم يُصيبه أذى شوكة فما فَوقها إلا كفر الله بها سيئاته وحُطت عَنه ذنوبه كما تُحطَ الشَّجرة ورقها))](٥٩) (چوم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ تای هەبوو نەخۆش بوو پێم وت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ تایەکی زۆر توندت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ ڕاست دەکەیت، من تا گرتوومی بە ئەندازەی دوو کەس لە ئێوە، منیش وتم بەڵێ ئەوەش لەبەر ئەوەیەکە دوو پاداشتت هەیە؟. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەوە ئاوهایە (واتە: بەئەندازەی دوو کەس تای هەیە و بە ئەندازەی دوو کەسیش پاداشتی هەیە)، هەر موسوڵمانێك تووشی ئازارێك ببێت ئایا ئازاری دڕکێك ببێت یان لەوە سەرو تر، خوای گەورە دەیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناه و تاوانەکانی وەگوناهەکانی لێ هەڵدەوەرێنێ هەروەك چۆن درەخت گەڵاکانی هەڵدەوەرێت ، وەلە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((...ما لم يُنزل ما أصابه من البلاءِ بغير الله، أو يدعو غيرَ اللهِ في كشفهِ))(٦٠). (... بەمەرجێك ئەوەی توشی هاتووە لە بەلا و موسیبەت تەنها لە خوای گەورەی بزانێت (لەدەستی کەسی تری نەزانێت)، وە جگە لە خوای گەورە داوا لەهیچ کەسێکی تر ناکات لەسەری لا بەرێت).

* ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لا يتمنين أحدكم الموت لضُرٍّ أصابه، فإن كان لابُدَّ فاعلاً فليقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي، وتوفَّني إذا كانت الوفاة خيراً لي))(٦١). (هیچ کەسێك لە ئێوە ئاواتە خوازی مردن

(٥٩) أخرجه: البخاري (٥٦٤٧)، ومسلم (٢٥٧١)، واحمد (٣٨١/١).

(٦٠) اخرجه: ابن ابي الدنيا في (الكفارات) (٦٩/٢) ، وحسنه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٥٠٠).

(٦١) اخرجه: البخاري (٦٣٥١) ، ومسلم (٢٦٨٠) ، والترمذي (٩٧١) ، وأو داوود (٣١٠٨) ، والنسلئي (٣/٤) ، وابن ماجة (٤٢٦٥).

نەبێت بەهۆی زیانێك کە پێی گەیشتووە، وەگەر ئەو کەسە هەر داوای مردنی کرد با بڵێت ئەی خوایە ژیانم پێ ببەخشە گەر ژیان بۆ من بە سوود وباشترە، مردنم پێ بدەو بم مرێنە گەر مردن چاکترە بۆ من).

و عبدالرحمنی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: " ابتلینا بالضراء فصبرنا وابتلینا بالسراء فلم نصبر"(٦٢) "تاقی کراینەوە بەناڕەحەتی ئاراممان گرت، وە تاقی کراینەوە بە خۆشی ئارامگمان نەگرت). ئیبن مەسعود ﷺ فەرموویەتی: "...وایم الله ما هو الا الغنى والفقر ومااباڵی بایهماابتلیت لان حق الله في کل منهما واجب ان کان الغنی اِن فیە للعطف وإ ن کان الفقر اِن فیە للصبر" (٦٣)."سوێند بەخودا ژیان یا دەوڵەمەندی یە یا هەژاریە هیچ گوێ نادەمێ بەهەر کامیان تاقی بکرێمەوە چونکە لە دەوڵەمەندی و هەم لە فەقیریشدا ماف و گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار پێویستە، گەر دەوڵەمەندی بوو سۆز و بەزەیی خودای تێدایە، وەگەر هەژاری بوو ئارامگری تێدایە بۆ خوا".

٦- ئارامگرتن لەسەر خێزان و منداڵ و کەمی ماڵ و سەروەت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ (الأنفال: ٢٨) . [(هەروەها بزانن ماڵ و سامان و منداڵتان بۆ تاقیکردنەوەیە، خوای میهرەبانیش پاداشتی زۆرو بێ سنووری لە لایە)(بۆ ئەو کەسانەی کە نایەڵن ماڵ وسامان و منداڵیان ببێتە کۆسپ لە ڕێگەی خواپەرستیدا خواش پاداشتی هەرە گەورەی لەلایە].

(٦٢) انظر: (مختصر منهاج القاصدين) (ص/٢٧٠).

(٦٣) أخرجه:ابن المبارك (الزهد) برقم (١٥٢) وقال محققه سنده حسن.

وه دووباره ده‌فه‌رمویت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا﴾ (الفرقان: ٢٠). طه‌به‌ری (رحمه الله) ده‌فه‌رمویت: : "جعلت بعضكم لبعض بلاءً لتصبروا على ما تسمعون منهم ولما ترون من خلافهم" [٦٤] "واته: هه‌ندێكتانم كردووه‌ته تاقیكردنه‌وه بۆ ئه‌وانی ترتان تا ئارامگرن له‌سه‌ر وته وهه‌ڵوێسته‌كانیان، وه‌به‌چاوی خۆتان دژایه‌تی و جیاوازیان ببینن".

مرۆڤ تاقیده‌كرێته‌وه سه‌ره‌تا له‌هه‌ره نزیكه‌كانیه‌وه؛ هاوسه‌ر و منداڵه‌مانی وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رمویت: ((إنَّ أَمْرَكُن مهما يَهُمنيّ بعدي ولنْ يَصبرِ عليكُن بعدي إلا الصابرون))[٦٥]. (ئه‌وه‌ی توشتان دێت له دوای من جێی نیگه‌رانیه بۆ من وه‌ته‌نها هه‌ر ئارامگران له دوای من ده‌توانن ئارامگرن له‌گه‌ڵتان).

وه‌له‌ڕیوایه‌تێكی تردا ده‌فه‌رمویت:((لا يعطف عليكن بعدي إلاّ الصادقون الصابرون))[٦٦] (به‌سۆز و به‌زه‌یی نابن بۆتان له دوای من ته‌نها ڕاست گۆیان و ئارامگران نه‌بێت).

كه وابوو پێویسته له‌سه‌ر پیاو كه ئارامگر بێت له‌گه‌ڵ خێزان و منداڵه‌كانی هه‌ر وه‌ك شافیعی (رحمه الله) فه‌رمووی:

---

(٦٤) انظر: تفسير (جامع البيان): رقم (١٩٩٥٩).

(٦٥) اخرجه:احمد (الفضائل) (١٢٥٨) وقال محققه:إسناده صحيح ، الترمذي (٣٧٤٩) وقال: حديث حسن صحيح غريب ، والحاكم (٣١٢/٣) وصححه على شرط الشيخين ، وابن حبان (٦٩٩٥) وقال محققه:حديث صحيح ، وحسنه الشيخ الألباني في: (صحيح الترمذي) (٢٩٤٨)، (صحيح الجامع) (٢٠٠٢) ، (المشكاة) (٦١٢١).

(٦٦) اخرجه: البزار في (المسند) (٢٥٩٠) ، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٣١٨).

من يتمنَّ العمر فاليدرع صبرا على احبائه
من يعمَّر يلقَ في نفسه ما يتمناه لأعدائه(٦٧)

واتە: (هەر کەس ئاوات بەتەمەن درێژی دەخوازێت باقەڵغان بپۆشێت لە بەرامبەر خۆسەویستانی چونکە ئەوەی تەمەن درێژ بێت توشی ئەوانە دێت کە جێی ئاواتی بوو بۆ دوژمنانی).

* ئەبو یەحیای سوهەیبی کوڕی سینانﷺ فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((عَجباً لِأَمر المؤمن، إِنَّ أمره كُلهُ له خيرٌ وليس ذلك لاحد إِلا للمؤمن، إن أصابته سراء شكر فكان خيراً له، وإن أصابته ضَـرّاء صَـبَرَ فكان خَيراً له))(٦٨) (سەرم سوڕماوە بۆ کارەکانی بڕوادار، هەمووی خێروچاکەن بۆی، ئەوەش بۆ کەس نی یە تەنها بۆ بڕوادارە، گەر چاکە و خێری توش هات سوپاسی خوا دەکات و ئەوە چاکەیە بۆ ئەو، وەگەر ناخۆشی و زیانی توش هات ئارامگر دەبێت لەسەری و ئەوەش چاکەیە بۆ ئەو).

* موعەمەر فەرموویەتی: [جاءت امرأة إلى الحسن البصري، فقالت: يا أبا سعيد لا والله ما خلق الله شيئاً أبغض إليَّ من زوجي، فهل تأمرني أن أختلع ؟ فقال الحسن: كنا نتحدث ((إنَّ المختلعات هن المنافقات)). قال: فضربت رأسها بيدها فقالت: إذاً أصبِرُ على بركة الله، فقال الحسن: يرحمها الله ما كنت أرى أن تفعل، وعن أبي عبيدة ابن عبد الله رحمه الله قال: إن الله كتب الجهاد على الرجل، والغيرة على النساء، فمن صَبَرَ مِنْهُنَّ كان لها أجر المجاهد] (٦٩). (ئافرەتێك هات بۆ لای حەسەنی بەصری وتی ئەی باوکی سعید

---

(٦٧) انظر: ديوان الشافعي (ص:٧).

(٦٨) اخرجه: مسلم (٢٩٩٩) ، واحمد (٣٣٢/٣) ، و الدارمي (٣١٨/٢) ، والطبراني (الكبير) (٧٣١٦) ، والبيهقي (الكبرى) (٣٧٥/٣).

(٦٩) انظر: (المصنف) لعبد الرزاق رقم (٢٠٤٠٢) ، و(١٣٢٧٠).

**سوێند به‌ خوا هیچ شتێك له‌ دروست كراوه‌كانی خوای گه‌وره‌ نیه‌ به‌لای منه‌وه‌ له‌ پیاوه‌كه‌م زیاتر ڕقم لێی بێت ئایا فه‌رمانم پێ ده‌كه‌یت تا ته‌ڵاقی خۆمی لێ وه‌رگرم و خولعی له‌گه‌ڵ بكه‌م؟).**

**حه‌سه‌نی به‌صریش (رحمه الله) فه‌رمووی: ئێمه‌ قسه‌مان ده‌كرد وده‌مان وت ئه‌وانه‌ی ته‌ڵاق له‌ پیاوه‌كانیان ده‌ستێنن دووڕوون، موعه‌مه‌ر وتی: ئافره‌ته‌كه‌ دای به‌سه‌ریدا به‌ده‌سته‌كانی و وتی كه‌وا بوو ئارام ده‌گرم له‌ په‌نای فه‌ڕو به‌ره‌كه‌تی خوای په‌روه‌ردگار، وه‌حه‌سه‌نی به‌صریش وتی: خوا ڕه‌حمی پێ بكات وام نه‌ده‌بینی ئه‌و به‌و شێوه‌یه‌ ڕه‌فتار بكات.**

**ئه‌بو عوبه‌یده‌ی كوڕی عبدالله ﷺ فه‌رموویه‌تی: (خوای گه‌وره‌ ومیهره‌بان جیهادی له‌سه‌ر پیاو فه‌رزكردووه‌، وه‌غیره‌شی له‌سه‌ر ئافره‌ت، هه‌ر ئافره‌تێك ئارامگرێت له‌سه‌ر غیره‌كه‌ی ئه‌وه‌ پاداشتی موجاهیدی ده‌ست ده‌كه‌وێت).**

**٧- ئارامگرتن له‌ سه‌ر موسوڵمانه‌ لاواز و هه‌ژاره‌كان:**

**خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت:** ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ... ﴾ (الكهف: ٢٨).(ئارامگر و خۆڕاگربه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سانه‌دا كه‌ خواپه‌رستی ده‌كه‌ن و یادی په‌روه‌ردگاریان ویردی سه‌رزاریانه‌ له‌ به‌ره‌به‌یان و ده‌مه‌و ئێواراندا، مه‌به‌ستیانه‌و ده‌یانه‌وێت كه‌ ئه‌و زاته‌ له‌ خۆیان ڕازی بكه‌ن، ڕوو له‌وان وه‌رمه‌گێڕه‌و (ڕوو مه‌كه‌ره‌ دونیاپه‌رستان و ده‌وڵه‌مه‌ندان) ئه‌وه‌ كاری ئه‌وانه‌ یه‌ كه‌ جوانی و ڕازاوه‌یی ژیانی دنیایان ده‌وێت ...).

**عه‌بدوڕحمانی كوڕی ئه‌بو ئومامه‌ ﷺ فه‌رمووی: ((نزلت هذه الآية على النبي ﷺ وهو في بعض أبياته (وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم ...) خرج يلتمس فوجد قوما**

یذكرون الله منهم ثائر الرأس و حاف الجلد، وذو الثوب الواحد فلما رآهم جلس معهم فقال ((الحمد الله الذي جعل في أمتي من امرنى ان اصبر نفسي معهم))[٧٠]. (ئەم ئایەتە دابەزیە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان پێغەمبەر ﷺ چوو گەڕاو بینی لە ناو خەڵكیدا كۆمەڵێك هەن یادی خوای گەورە دەكەن تیایاندا بوو قژی تۆزاوی و شڵەژاو بوو و پێستی وشك ببوەوە وهەیان بوو خاوەن تەنها پۆشاكێك بوو كاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بینی لە گەڵیان دانیشت و فەرمووی: سوپاس بۆ خوا كە لەناو ئومەتەكەمدا كە سانێك هەن خوای گەورە فەرمانی پێ كردووم ئارامگربم بۆیان و بە هەمیشەیی لە گەڵیان بم.

٨- ئارامگرتن لەسەر ئەزیەت و ئازاری خەڵكی:

خوای گەورە داوامان لێ دەكات ئارامگربین لە بەرامبەر ئازاری خەڵكی وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ﴾ (النحل: ١٢٦).واتە: (گەر ئازاردران بۆتان هەیە بەوێنەی ئەوە تۆڵەی ئازاری خۆتان بكەنەوە و گەر ئەوەش نەكەن و ئارامگربن ئەوە چاكترە بۆ ئارامگران).

حەسەنی بەصریش (رحمه الله) دەفەرموێت: "ابن آدم لاتؤذِ وإن أُذيت فاصبر"[٧١] "ئەی نەوەی ئادەمیزاد ئەزێتی كەس مەدە، وەگەر ئەزیەت و ئازار درایت بەئارام و خۆ ڕاگر بە".

---

(٧٠) أخرجه :الطبراني، وعبدالرزاق (التفسير) (١٦٧٠) مرسلاً وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠٩٩٨):رجاله رجال الصحيح ، و الطبري في (جامع البيان) (١١٣٤٨) وقال محققه: اسناده ضعيف، والبيهقي في (الدلائل) (٣٥٢/١) و الواحدي في (اسباب النزول) (ص/٢٢٤) وهو مرسل.

(٧١) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (١١).

علـی کـوڕی زەیـد دەفـەرموێت: "عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز ئـەم ئایەتـەی دەخوێندەوە: ﴿...وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ مَكَانًا ..﴾ (الفرقان: ٢٠)، و پاشـان دەیفـەرموو: (جُعـل بعضـکم لـبعض فتنـة فاصـبروا)[٧٢].(واتـە: هەنـدێکتان کراونەتە تاقیکردنەوە بۆ ئەوانی دیکەتان".

هەر لەم ڕووەشەوە عەطائی کوڕی ئەبو موسلیم دەفەرمووێت: "إن الجنـة حظـرت بالصبر والمكاره فلا تؤتى إلاّ من باب الصبر أو المكـروه"[٧٣]. " بەهەشـت پـەرژین کـراوە بە ئارامگرتن و ناڕەحەتی و بەهەشتیش تەنها لەڕێگەی ئارامگرتن و ناڕەحەتیـەوە دەست دەکەوێت".

لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر موسـوڵمانان بەتایبـەت بانگـەوازخوازان تێکـەڵاوی خەڵکی بکەن و ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوەکانیان بن، وەسـەردانی نەخۆشـەکانیان بکەن وە ئامادەی جەنازە کانیان بن وەیارمەتی هەژارەکانیان بـدەن، وەڕینمـوی نەزانـەکانیان بکـەن، بەهـەموو جورێـك بەدەمیانـەوە بچـن، ئەمـە کاتێـك وە بـۆ کەسانێك دەبێ کە توانای فەرمان کردنیـان هـەبێت بەچـاکەو توانـای ڕێ گرتنیـان هەبێت لە خراپە، وە ئەو کەسە نەفسی سەرکوت بکات تـا ئـازاری کـەس نـەدات و خۆی ڕابێنێ لـە سـەر ئـارامگرتن. کەواتـە بزانـە ئـەی بـرای موسـوڵمانم تێکـەڵاوی لەگەڵ خەڵکیدا بە و شـێویە چـاك و دروسـتە ڕەفتـاری پێغەمبـەر ﷺ و سـەرجەم پێغەمبەرانی تر بووە سەلامی خوایان لێبێت، وە هەروەها خولـەفای ڕاشـیدین، وە لەدوای ئەوان سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەتابیعیـەکان، و لـەدوای ئـەوانیش زانایانی موسوڵمانان و زۆربەی زانایانی شەرع زانی ئیسلام بەزەیی خوایان لەسەر

(٧٢) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٨٦).

(٧٣) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا(٣١).

بێت هەموو ئەمەیان لاپەسەند بووە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ... ﴾ (المائدة: ٢).(یارمەتی و کۆمەکیی یەکتر بکەن لەسەر چاکەو خواناسی).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((المؤمن الّذي يُخالِط النّاس ويصبر على آذاهُمْ خيرٌ – وفي رواية ((أعظم أَجراً)) مِن الّذي لا يخالط الناس، ولا يصبر على آذاهم))[٧٤]. (ئەو بڕوادارەی تێکەڵاوی خەڵکی دەکا و ئارام دەگرێت لەسەر ئازارەکانیان چاکترە– وەلەڕوایەتێکی تردا: پاداشتی گەورەترە لەو کەسەی تێکەڵاوی خەڵکی ناکاو ئارام ناگرێت لەسەر ئازارەکانیان).

وەلەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((المسلم الذي يخالط الناس ويصبر على آذاهم افضل من الّذي لا يخالطهم ولا يصبر على أذاهم))[٧٥]. (ئەو موسوڵمانەی تێکەڵاوی خەڵکی دەکات ئارام دەگرێت لەسەر ئازارەکانیان چاکترە لەو کەسەی تێکەڵاویان ناکات و ئارام ناگرێت لەسەر ئازارەکانیان).

وە خوای گەورە سوێند دەخوات و دەفەرموێت:﴿ وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ﴾ (العصر: ١ – ٣).
[فأي تواص يمكن أن يحدث إذا كان الإنسان لا يريد الاختلاط بغيره ويبتعد عن مواطن التناصح والتواصي ؟ وإن المؤمن الصادق لا يطيق مثل هذه الحياة، فإنما يصبر على الحياة ويحبها من اجل ما يجده من إخوانه من التوجيه النافع والكلام الطيب والصحبة الهنيئة][٧٦].

(٧٤) أخرجه: احمد (٥٠٢١)، والبخاري في (الأدب المفرد) (٣٨٨)، وابن ماجة (٤٠٣٢)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (٣٢٥٧)، وفي (السلسة الصحيحة) (٩٣٩)، (المشكاة) (٥٠٨٧)، وفي (صحيح الأدب المفرد)(٣٠٠).

(٧٥) في رواية الترمذي.

(٧٦) انظر: (مفسدات الأخوة). (ص: ٧٠).

(واته:کام وەسێت و ئامۆژگاری ڕێ دەکەوێت کاتێك مرۆڤ مەبەستی تێکەڵاوی نەبێت لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیدا وە دوور بکەوێتەوە لە جێگەکانی ئامۆژگاری و وەسێت ؟ بڕواداری ڕاستگۆ ناتوانێت بەو شێوەیە بژی، بەڵکو ئارام دەگرێت لەسەر ژیان و خۆشی دەوێت تەنها لەبەر ئەو دەستکەوتانەی کە دەستی دەخات لە ڕێنمونی برا موسوڵمانەکانی وتەی جوان و شیرین و هەر ئەوەش ژیانی پڕ لە سۆز و میهرەبانی و خۆشی و کامەرانیە).

**٩- ئارامگرتن لەسەر مردنی خۆشەویستان و بەڵا پڕ ئیش و ئازارەکان:**

ئەبو ئومامە ﷺ گێراویەتەوەکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يقول الله سُبحانهُ وتعالى: ابن آدم إنْ صَبرتَ واحتسبتَ عِند الصَّدمة الأولى، لم ارض لكَ ثواباً دون الجَنَّة))[٧٧]. خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی نەوەی ئادەم گەر توشی نارەحەتیەك هاتیت و ئارامت گرت لە ساتەوەختی یەکەمی ناخۆشیەکەدا، بەهیچ پاداشتێك ڕازی نابم بۆت جگە لە بەهەشت).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((يقول الله تعالى: ما لعبدي المؤمن عندي جزاءٌ إذا قَبضتُ صَفيَّهُ مِنْ أَهلِ الدُنيا ثُمَ احتَسَبَهُ إلا الجنة))[٧٨].(بەندەی بڕوادارم گەر خۆشەویستێکی لە نیشتەجێ بوانی دونیای لێ بسێنمەوە و ئارامگرێت و چاوە ڕێی پاداشتی من بکات ئەو هیچ پاداشتێکی نابێت لای جگە لە بەهەشت).

---

(٧٧) اخرجه: ابن ماجة (١٥٩٧)، وحسنه الشيخ الألباني في: (صحيح ابن ماجة) (١٢٩٨)، (مشكاة المصابيح) (١٧٥٨).

(٧٨) أخرجه: البخاري (١٢٩٠).

ئەبو زەرٍ ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی،: ((لا يموت بين امرأين مسلمين ولدان أو ثلاثةٌ فيصبران ويحتسبان فيريان النار أبداً))[٧٩]. (هەر کاتێك لەنێوان هاوسەری موسوڵماندا دوو یان سێ منداڵیان بمرێت، و ئارام بگرن وچاوە ڕێی پاداشتیان لە خوای گەورە بێت هەرگیز ئەو دوانە ئاگری دۆزەخ نابینن).

ئەنەس ﷺ فەرمووی بیستم لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەیفەرموو: ((إن الله عز وجل قال: إِذا ابتليت عبدي بحبيبتيهِ فَصَبَرَ [واحتسب] عوضتهُ مِنهُما الجَنَّة يريد عينيه))[٨٠]. وفي رواية: ((قال الله تعالى: إذا قَبضتُ مِن عبدي كريمتيه – وهو بهما ضنينٌ، لم أرضَ لَهُ ثواباً دون الجَنَّة إذا حَمِدَني عليها))[٨١]. (خوای گەورە فەرموویەتی: هەر کاتێك بەندەکەم تاقی کردەوە و توشی بەڵام کرد بەچاوەکانی ئەویش ئارامی گرت من لەجیاتی ئەو دوو چاوە بۆی دەگۆڕم بەبەهەشت. وە لە ڕیوایەتێکی تردا: خوای گەورە دەفەرموێت: هەر کاتێك بەندەکەم دووچاوەکەیم لێ سەندووە کە زۆر لای خۆشەویستە و ئەو سوپاسم بکات هیچ پاداشتێکی پێ ڕەوا نابینم کەمتر لە بەهەشت).

عەمری کوڕی شوعەیب نوسراوێکی نوسی بۆ عەبدوڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی حوسین سەرەخۆشی مەرگی کوڕەکەی لێ کرد لەو نوسراوەیدا باسی فەرموودەیەکی بۆ نوسی بوو کە بیستویەتی لە باوکی ئەویش گێڕاویەتەوە لە باپیریەوە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص کە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَ الله لا يرضى لِعَبدِهِ المؤمنْ إذا ذَهَبَ بِصفيهِ مِنْ أَهلِ الأرض، فَصَبَرَ

(٧٩) أخرجه: أحمد في (المسند) (٢١٣٧٣) وقال محققه الارناؤوط: إسناده حسن.

(٨٠) أخرجه: البخاري (٥٦٥٣)، ومسلم (٢٥٧٦)، والترمذي (٢٤٠٠).

(٨١) اخرجه: ابو نعيم في (الحلية) (١٠٣/٦) ، وصححه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٠١٠).

وَاحْتَسَبَ وقال ما أُمِرَبِهِ، بِثواب دُون الجَنَّة))[٨٢]. خوای گەورە ڕازی نابێت بەندەیەکی باوەڕداری کاتێك خۆشەویستێکی لە دونیا لێ بسێنێتەو ئەویش ئارام بگرێت وە چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای پەروەردگاری، وە ئەوە بڵێت کە فرمانی پێکراوە (واتە: إنا لله وأنا إليه راجعون)، هیچ پاداشتێکی ئەو بەندەیە بدرێتەوە کەمتر لە بەهەشت).

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بەلای ئافرەتێکدا کە لە پاڵ گۆڕێکدا دەگریا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: [((اتَّقی الله واْصبري)). فقالت: إليك عني، فإنك لم تُصب بمصيبتي قال: ولم تعرفه. فقيل لها: هو رسول الله ﷺ! فأخذها مثل الموت. فأتت باب رسول الله ﷺ فلم تجد عنده بوابين. فقال: يا رسول الله إني لم أعرفك فقال رسول الله ﷺ : ((إنَ الصَبْرَ عِندَ أول الصَدْمة))][٨٣]. (لە خوا بترسە و ئارام بگرە، ئافرەتەکەش وتی: وازم لێبێنە تۆ توشی ئەو بەڵاو موسیبەتە نەبوویت کە توشی من بووە، ئەنەس وتی: ئافرەتەکە پێغەمبەری ﷺ نەناسی، پاشان وتیان بە ئافرەتەکە ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئافرەتەکەش کاریگەر بوو بەو قسەیەی کە وتویەتی و پەشیمان بوو ئەنجا ئافرەتەکە هاتە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و هیچ کەسێکی نەبینی دەرگاوانی ماڵی پێغەمبەری خوا بێ ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەم ناسیت و من نەمزانی کە تۆ بوویت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئارامگرتن لە یەکەم ساتی توشبوونی

(٨٢) اخرجه: النسائي (٢٣/٤)، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (٤٠٤/٢) رقم (١٧٦٥)، وفي (الأحكام) (٢٣) ، وفي (صحيح الجامع الصغير) (١٨٥١).

(٨٣) اخرجه: البخاري (١٤٨/٣) رقم (١٣٠٢)، ومسلم (٩٢٦) اللفظ له، وأبو داود (٣١٢٤)، والترمذي (٩٨٧)، وابن ماجة (٥٩٦).

به‌لاکه‌دایه، وه له‌ڕیوایه‌تێکی تردا فه‌رمووی: ((إنَّما الصبر عند الصدمة الأولى))[٨٤]. ئارامگرتنی ڕاسته‌قینه ئه‌و ئامگرتنه‌یه‌که له یه‌که‌م ساتی به‌رکه‌وتنی به‌لاکه‌دایه).

ئوسامه‌ی کوڕی زه‌ید ﷺ فه‌رمووی: [أرسلت بنتُ النبي ﷺ إليه: أنَّ ابناً لي قُبض فَأْتِنا. فأرسل يقرأ السلام ويقول: ((إنَّ لله ما أَخَذَ، وَلَهُ ما أَعْطى، وكُلُ شَيْءٍ عِنْدَه بِأَجَلٍ مُسمي، فَلْتَصْبِرْ وَ لْتَحْتَسِبْ)). فأرسلت إليه تُقسمُ عليه ليأتينها، فقام ومعه سعد بن عُبادة، ومعاذ بن جَبل، وأبي بن كعب، وزيد بن ثابت، ورجالٌ. فرفع الى رسول الله ﷺ الصَّبـي، ونَفْسُهُ تَقَعقَع ففاضت عيناه، فقال سعد: يا رسول الله ما هذا ؟ قال: ((هذا رحمة جعلها الله في قُلوب عِبادِهِ، وَانَّما يَرْحَمُ الله مِنْ عِبادِهِ الرُحَمَاءِ))] [٨٥]. (کچێکی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ که‌سێکی نارد بۆ لای پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ تا به پێغه‌مبه‌ر ﷺ بلێت کوڕێکمان له‌مردندایه و بابێت بۆ ئێره پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌و که‌سه‌ی نارده وه بۆلای وسلاوی بۆ نارد و پێی فه‌رموو خوای گه‌وره ئه‌وه‌ی وه‌ری ده‌گرێته‌وه و ئه‌وه‌ی ده‌یبه‌خشێت هه‌ردوکی هی خۆیه‌تی و هه‌موو شتێك لای خوا به واده‌ی دیاری کراوی خۆیه‌تی و تۆش ئارام بگره و چاوه‌ڕوانی پاداشت له خوای گه‌وره‌بکه، ئوسامه‌ی کوڕی زه‌ید ﷺ ده‌لێ: دووباره کچه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ناردیه‌وه به شوێنی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ سوێنی لێ خوارد ده‌بێت هه‌ر بێن بۆ سه‌ردانی، پێغه‌مبه‌ریش ﷺ چوو له‌گه‌ڵ سه‌عدی کوڕی عوباده و موعازی کوڕی جه‌به‌ل و ئوبه‌ی کوڕی که‌عب و زیدی کوڕی سابت و کۆمه‌ڵێك پیاوی تر، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ منداڵه‌که خرایه باوه‌شی و منداڵه‌که هه‌ناسه‌ی توند ببوو سنگی لرخه‌لرخی لێ

---

(٨٤) لفظ مسلم (٩٢٦).

(٨٥) اخرجه: البخاري (٦٦٥٥)، ومسلم (٩٢٣)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (٢/٤٠٣) رقم (١٧٦٢): صحيح، و(صحيح ابن ماجة) (١٢٩١).

دەبیسرا و لەڕۆح دەرچوندابوو، پێغەمبەر ﷺ هەر دوو چاوی پڕ بوو لە فرمێسك. سەعد وتی: ئەوە چی یە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەزەییەکە خوا خستویەتیە دڵی بەندەکانیە وە خوای گەورەش بەزەیی بۆ ئەوانە دەبێت کە بەزەییان هەیە بۆ بەندەکانی خودا.

وەلەو ئارامگرتنە ئارامی یعقوب ؑ بۆ لەدەست دانی یوسفی کوڕی وەك خوای گەورە وەسف و باسی بەچاکە دەکات و دەفەرموێت :[فَهُوَ كَظِيمٌ] حەسەنی بەصرِی (رحمه الله) دەفەرموێت: "(الكظيم) أي:الصبور[٨٦]" "واتە زۆر ئارامگر"، ئیبن تیمییە (رحمه الله) دەفەرموێت: "المؤمن مأمور عند المصائب أن يصبر و يسلم، وعند الذنوب أن يستغفر ويتوب، قال تعالى: ﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ ... ﴾ (غافر: ٥٥)، فأمر الله تعالى بالصبر على المصائب والاستغفار من المعائبِ" [٨٧] (بڕوادار فەرمان پێکراوە لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا کە ئارامگر بێت و گەردن کەچ بێت، وەلەکاتی گوناه کردندا دەبێت داوای لێخۆش بوون بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئارام و خۆڕاگربە، چونکە بەڵێن و وادەکانی خوا هەر دێتەدی، داوای لێخۆشبوونیش بکە بۆ گوناهەکانت) خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە بە ئارامگرتن لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا وە داواکردنی لێخۆش بوون لە کاتی کردار و کەم وکوڕیەکاندا.

عەبدول ڕەحمان فەرموویەتی ئیبن عەباس ﷺ لە سەفەرێکدا بوو هەواڵیان دایە قوثمی برای مردووە وە ئەویش لەڕێگە لایدا و پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد و درێژەی دا بە دانیشتنی ئەو دوو ڕکاتە نوێژە لە پاشان هەڵسا چو بۆ لای

---

(٨٦) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (١١٧).

(٨٧) أنظر: (مجموع الفتاوى) (١١/١٤٤).

ولاخەکەی و ئەم ئایەتەی دەوتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾(البقرة: ١٥٣)[٨٨].(لەڕوی ناڕەحەتی و کێشەکاندا بوەستن بە نوێژ خوێندن و ئارامگرتن و ئەو دوانە گەورە و گرانن تەنها بەلای ملکەچەکانەوە).

ئوم کولثومی کچی عوقبەوە سەبارەت بەڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: (واستعينوا بالصبر والصلاة): دەفەرموێت: (غشُيَّ على عبد الرحمن بن عوف غشيّة فظنوا أنّه فاضَ نفسهُ فيها فخرجت امرأته أم كلثوم إلى المسجد تستعينُ بما أُمِرتْ بهِ مِن الصبر والصلاة فلما افاق قال: أغشُي عليَّ آنفاً ؟ قالوا: نعم، قال: صدقتم انهُ جاءني ملكان فقالا لي: انطلق نحاكُمك الى العزيز ألامين، فقال ملك أخر: أرجعاه فانِ هذا مِمَن كُتبِتْ له السعادة وهم في بطون أمهاتهم ويستمتع الله بِه بنوهُ ما شاء الله، فعاش بعد ذلك شهراً ثم مات) [٨٩].(عبدالرحمنی کوڕی عوف ﷺ بێ هۆش کەوت وا گومانیان برد گیانی دەر چوو بێت، خێزانەکەی ئوم کەلثوم لە ماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت تا وەکو بەوەی فرمانی پێ کراوە لە نوێژو ئارامگرتن ئەنجام بدات تا کەمێك دڵی ئارام ببێتەوە پاش کەمێك عەبدوڕحمان بەهۆش هاتەوە و وتی: ئایا لەمەو پێش من بێ هۆش کەوتم ؟ وتیان: بەڵێ. وتی: ڕاست دەکەن دوو مەلائیکە هاتن بۆ لام و بەمنیان وت: هەستە با بتبەین تا دادگاییت بکەین لای خوای خاوەن دەسەڵات

(٨٨) أخرجه: البيهقي (شعب الأيمان) (٩٦٨٢)، وقال الحافظ في (الفتح) (٢/٢٢٢): اخرجه الطبري بإسناد حسن.

(٨٩) اخرجه: عبد لرزاق (المصنف) (٢٠٠٦٥) واللفظ له، والحاكم (٢/ ٢٦٩) وصححه على شروطهما ووافقه الذهبي، و ابن سعد (٣/ ١٣٤) ، وابن بطة (الإبانة) (١٥٨٧)، والبيهقي (الشعب) (٩٦٨٤)، واللالكائي (١٢٢٠)، والدينوري في (المجالسة) (٣٧٨) وقال محققه: إسناده صحيح ، والآجري (الشريعة) (٤٧٦) ، وقال البوصيري في (مختصر الاتحاف) (٧٥٢٠): إسناده صحيح، أخرجه أيضاً الفريابي (القدر) (٤٣٤) وقال محققه: إسناده حسن والأثر صحيح.

و متمانە پێکراو ڕۆیشتن، مەلائیکەیەکی تر پێمان گەیشت وتی: بیگێڕنەوە ئەمە لەو کەسانەیە کە پێشتر بەختەوەریان بۆ نوسراوە هێشتا لە سکی دایکیاندا بوون خوای گەورە تا ماوەیەکی تر منداڵەکانی بەختەوەر دەکات و خۆشحاڵ دەژین لەگەلیدا، لەپاش ئەمە مانگێك ژیا و پاشان مرد).

**١٠- ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەری خوای گەورە:**

پێویستە لە سەرموسوڵمان گەردن کەچی تەواوی هەبێت بۆ خواو ڕازی بێت بە قەزاو قەدەری خوا هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ .. ﴾ (الطور: ٤٨). ئیبن کەثیر (رحمه الله) دەڵێت:" يقول تعالى لرسوله ﷺ: أي كما أكرمك بما انزل إليك فاصبر على قضائه وقدره واعلم انه سُيدَ بّرُكَ بحُسن تدبيره ". "خوای گەورە بە پێغەمبەری فەرموو چۆن پەروەردگارت ڕێزی لێ گرتوویت بەو پەیامەی کە بۆتی ناردووە تۆش ئارامبگرە لەسەر قەزاو قەدەرکانی خواو بزانە خوای گەورە باشترین دۆخ و بارت لێ دێنێتە پێش".

پاشان خوای گەورە دەفەموێت: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾ (التغابن: ١١). أي: من أصابته مصيبة فعلم انها بقدر الله فصبر وأحتسب واستسلم لقضاء الله، هدى الله قلبه وعوضته عما فاته من الدنيا، وعما أصابه و هدى قلبه و جعل فيه يقيناً صادقاً فعلم أن ما أصابه لم يكن ليخطأه وما اخطأه لم يكن ليصيبه. ويستفاد من هذه الآية: أن الصبر على المصيبة سبب لهداية القلوب وطمأنينتها وأنها من ثواب الصابرين"[٩٠]. "هەر کەسێك توشی بەڵایەك ببێت وابزانێت ئەو کارە بەقەدەری خوای گەورە بووە و ئارام بگرێت و بەهیوای پاداشتەکەی بێت لای خوای گەورە و گەردن کەچ بێت بەرامبەر قەزاو قەدەرەکانی، خوای گەورە

---

(٩٠) (تفسير القرآن العظيم) لابن كثير (٦/٣٢١).

ڕێنمونی دڵی ئەو کەسە دەکات وەئەوەی لە دونیا لە دەستی چووە و توشی هاتووە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە دڵی، دڵنیاییێکی ڕاستگۆیانەی پێ دەبەخشێ، ئەو کات دەزانێ ئەوەی توشی بووە، دەبوو هەر توش ببێت وە ئەوەشی کە توشی نەبووە دەبوو هەر توشی نەبێت، وە لەم ئایەتەدا ئەو سوودە وەردەگیرێت کە ئارامگرتن لەسەر بەڵا هۆکارە بۆ هیدایەت و ڕێ نمونی دڵەکان و جێگیر بوونیان ئەمەش تەنها لەپاداشتی ئارامگرەکانە".

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إن عِظم الجزاءِ معَ عظم البلاءِ، وإنّ الله إذا أَحب قوماً ابتلاهم فمن رَضِيَ فله الرضاء ومن سخط فله السخط))[٩١]. (گەورەیی پاداشت لەگەڵ گەورەیی بەڵادایە، خوا گەر کەسانێکی خۆشی بوێت تاقیان دەکاتەوە هەر کەسێك بیەوێت بەو بەڵایە خوا ڕازی دەکات وە هەر کەسێك ناڕازی بێت خواش ناڕازی دەکات).

پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکاتەوە هەرکەسێك بەڵاکەی گەورە و توند بێت ئەو کەسە پاداشتەکەی گەورەترە، وەنیشانەی خۆشەویستی یە بۆ ئەو، خوا بەندەکانی توشی بەڵا دەکات تا ببێتە مایەی کە فارەت و سڕینەوەی گوناه و تاوانەکانیان لەگەڵ زیاد بوونی چاکە وە ئەجرو پاداشتەکانیان، هەر کەسێك ڕازی ببێت لە خوای پەروەردگار بەوەی بەسەری هێناوە، ئەو کەس لە لا یەنی خواوە ڕازی بوونی بۆ هەیە، وەهەر کەسێك ناڕازی ببێت بەوەی خوا بەسەری دێنێت ئەو کەسە لەلایەنی خواوە ناڕازی بوونی بۆ هەیە. ڕازی بوون و ناڕازی بوون لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دوو سیفەتن لە سیفەتەکانی خوا پێویستە باوەڕمان پێ ی هەبێت کەهی خوای پەروەردگارە بەشێوەیەك بگونجێ بۆ خوای گەورە وەك باقی

(٩١) أخرجه: الترمذي (٢٣٩٨)، ابن ماجة (٤٠٣١)، وحسنه الشيخ الألباني في: (صحيح الترمذي) (١٩٥٤)، و(صحيح ابن ماجة) (٣٢٥٦)، و(السلسلة الصحيحة) (١٤٦).

سیفەتەکانی تری. ڕەزا بوون لە مرۆڤدا ئەوەیە کە فرمانەکەی تەسلیم بە خوا بکات و گومانی باشی ببێ بە خوای پەروەردگار و تەماعی پاداشتی ببێت، وە ناڕەزایی پێ ناخۆش بوون خۆبەدەست نەدا نەبۆ فەرمانەکانی خوا وەلەم فەرموودەدا هەڕەشەیەکی توند هەیە بۆ ئەوانەی ناڕازین بە قەزاوقەدەری خوای گەورە و ئارام ناگرن لەسەر بەلاَ.

**١١- ئارامگرتن لەسەر بەلاَ:**

**خوای گەورە ئارامگرتنی لە ئێمە دەوێت کاتێك توشی بەلاَیەك دەبین لەوانەی کە بەندەکانی پێ تاقی دەکاتەوە هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ... وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ .. ﴾ (لقمان: ١٧) (ئارام بگرە لەوەی توشت دەبێت). وە دەفەمویت: ﴿ ...وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ ... ﴾ (الحج: ٣٥). واتە: (ئەوانەی ئارامگرن لەوانەی کەتوشیان دەبێت).**

**وەدەفەرموێت:** ﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (البقرة: ١٥٥).(تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچوونی بەرو بوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن...).

**وەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((قال الله تعالى: إذا ابتليت عبدي المؤمن..فلم يشكني الى عواده أبدلْتُه لَحْماً خيراً مِنْ لحمهِ، ودماً خيراً مِنْ دمهِ ثُمَ يَستَأنِف العمل))[٩٢].**

---

**(٩٢) أخرجه: الحاكم ٣٤٩/٠١) وصَّحَحَه على شرطهما ووافقه الذهبي، البيهقي في (الكبرى) (٣٧٥/٣)-و(شعب الأيمان) (٩٩٤٣) وقال: إسناده صحيح، وقال الحافظ العراقي في تخريجه على (الأحياء) (٢٠٩/٢): أخرجه البيهقي وإسناده جيّد. وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٧٢)**

(خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: هه‌ر كاتێك به‌نده‌یه‌كی بڕوادارت دی خۆم توشی نه‌خۆشی و به‌ڵایه‌كم كرد ئه‌و سكاڵای لێ نه‌كردم لای ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌سه‌ردانی ده‌كه‌ن ئه‌و كه‌سه من گۆشته‌كه‌ی بۆ ده‌گۆڕم به چاكتر له گۆشته‌كه‌ی خۆی، وه خوێنه‌كه‌ی بۆ ده‌گۆڕم به‌باشتر له خوێنه‌كه‌ی خۆی و گوناهه‌كانی پێشوی ده‌سڕمه‌وه له‌مه‌و دوا كاره‌كانی له‌سه‌ر تۆمارده‌كرێت).

ئه‌نه‌س ﷺ ده‌گێڕێته‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((إذا أراد الله بعبده الخير عجّل له العقوبة في الدنيا وإذا أراد بعبده الشرَّ أمسك عنه بذنبه حتى يوافى بهِ يوم القيامة))[٩٣]. هه‌ر كاتێك خوای گه‌وره ویست و ئیراده‌ی چاكه‌ی به‌به‌نده‌كه‌ی هه‌بێت ئه‌و كه‌سه خوای گه‌وره تۆڵه‌كه‌ی بۆ پێش ده‌خات له دونیا دا، وه‌هه‌ركاتێك خوای گه‌وره ویست و ئیراده‌ی شه‌ڕو خراپه‌ی به به‌نده‌كه‌ی هه‌بێت خوای گه‌وره تۆڵه‌ی به‌ڵاو موسیبه‌ته‌كانی لێ دوا ده‌خات تاوه‌كو نه‌بێت به‌كه‌فاره‌تی گوناهه‌كانی، دواتر به‌گشت گوناهه‌كانیه‌وه بچێته به‌رده‌م په‌روه‌ردگار وتۆڵه و سزای هه‌موویان له‌وێ وه‌ربگرێته‌وه).

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌فه‌رمووده‌یه‌كی تردا ده‌فه‌رموێت: ((إنَّ العبد إذا سبقت له من الله منزلة فلم يبلغها بعمل إبتلاه الله في جسده أو ماله أو في ولدهِ ثم صبّرهُ على ذلك حتى يُبلغه المنزلة التي سبقت له من الله عز وجل))[٩٤]. (به‌نده هه‌ركاتێك پله‌و پایه‌یه‌كی بۆ دیاری كرابێت لای خوا ئه‌و كه‌سه به‌چاكه كردن پێی نه‌گات خوای گه‌وره

(٩٣) اخرجه: الترمذي (٢٣٩٦)والحاكم (١/٣٤٩) وصححه ووافقه الذهبي، واخرجه ايضاً: احمد (٨٧/٤)، وابن حبان (٢٩١١) وقال محققه شعيب الارناؤوط: إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٠/ ١٩٢): رواه الطبراني وإسناده جيّد.

(٩٤) اخرجه: أحمد (٢٧٢/٥)، وأبو داود (٣٠٩٠)، وأبو يعلى (٩٢٣) ، وابن حبان (٢٩٠٨) ، والحاكم (٣٤٤/١) ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٤٠٩).

توشی به‌ڵای ده‌کات له‌لاشه‌یدا یان له سامانیدا یان له منداڵیدا له پاشان خوا ئارامگری پێ ده‌خشێت له‌سه‌ر ئه‌و کارانه تا ده‌یگه‌یه‌نێته ئه‌و پله‌یه‌ی که‌پێشتر بۆی دیاری کراوه له‌لایان خوای گه‌وره‌وه).

که‌واته نیشانه‌ی چاکه ویستنی خوای په‌روه‌ردگار به‌به‌نده‌که‌ی ئه‌وه‌یه توشی به‌ڵای ده‌کات جارێك له‌نه‌فسی خۆیدا وه جارێك له خێزانی و منداڵیدا وه جارێك له ماڵ و سه‌روه‌تیدا، تا هیچی به‌سه‌ره‌وه نامێنێ و له دونیا به‌بێ گوناهی ده‌رده‌چێت و ده‌گاته خزمه‌تی خوای په‌روه‌ردگاری وه هیچ گوناهی نابێت تۆڵه‌ی له‌سه‌ر وه‌ربگرێت، وه نیشانه‌ی ویستی خراپ له‌لای خوای په‌روه‌ردگار به‌به‌نده‌کانی ئه‌وه‌یه له دونیا گوناهه‌کانی به‌سه‌ره‌وه بهێڵێته‌وه و توشی به‌ڵای نه‌کات تاببێت به که‌فاره‌تی گوناهه‌کانی و هه‌موو گوناهه‌کانی هه‌ر به‌سه‌ره‌وه ده‌مێنێت و به هه‌موویانه‌وه ده‌چێته‌وه خزمه‌تی خوای په‌روه‌ردگار ئه‌و کات تۆڵه‌ی لێ ده‌سێنرێته‌وه وسزا ده‌درێت، وه‌واتای (امسك عنه) له‌فه‌رمووده‌ی یه‌که‌مدا ئه‌وه‌یه تۆڵه‌که‌ی دوا ده‌خات بۆ قیامه‌ت، وه واتای (یوافی به) که‌له‌فه‌رمووده‌ی دووه‌مدایه ئه‌وه‌یه ئه‌و که‌سه به‌گوناهه‌کانی یه‌وه ده‌یهێنن تاله دوا ڕۆژدا، سزای هه‌مووی وه‌ربگرێت ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ش ئاماژه‌ده‌کات ئه‌و به‌ڵایه‌ی مرۆڤی پێوه گیرۆده ده‌بێت، هۆکاری سڕینه‌وه‌ی گوناهه‌کانیه‌تی گه‌ر ئارامگربێت و بزانێت که پاداشته‌که‌ی ته‌نها لای په‌روه‌ردگاری یه‌تی).

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌فه‌رمووده‌یه‌کی ترد ده‌فه‌رموێت: ((...فما یبرح البلاء بالعبد حتى یترکه یمشي على الأرض وما علیه خطیئة))[٩٥].(... به‌رده‌وام به‌ڵا توشی

---

(٩٥) أخرجه: الترمذي (٢٣٩٨)، وابن ماجة (٤٠٢٣)، واحمد(١/١٨٥)، والحاكم (١/٤١)، والدارمي (٢/٣٢٠)، البیهقي (٣/٣٧٢)، وابن حبان (٢٩٠١) وقال محققه: إسناده حسن، وصححه

بەندە دەبێت تاوای لێ دەکات بەسەر زەویدا بگەڕێت و هیچ گوناهی بەسەرەوە نەمێنێت).

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺدەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ کەسێك لەبەندەکان بەلاکەی زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: ((أشَد الناس بَلاءً الأنبياء ثم الأمثل فالأمثل يُبتلى العَبدُ على حسب دينهِ فأن كان في دينه صلباً اشتد بَلاءهُ، وإنْ كان في دينه رقه ابتلى على حسب دينه، فما يبرح البلاء بالعبد حتى يتركه يمشي على الأرض وما عليه خطيئه))[٩٦] (واتە: گەورەترین بەلا لە خەڵکاندا توشی پێغەمبەران دەبێت پاشان هاو وێنەی ئەوان پاشان هاوێنەی ئەوان، مرۆڤ بە گوێرەی ئاینەکەی توشی بەلا دەبێت گەر ئەو کەسە لەئاینەکەیدا ڕەق وتوند و تۆڵ بێت، بەلاکەی لەسەر توند دەکرێت، وە گەر لە ئاینەکەیدا نەرمبێت بەلاکەی لەسەر نەرم دەکرێت بەگوێرەی ئاینەکەی دەبێت، و بەندە بەردەوام توشی بەلا دەبێت تاوای لێ دەکات بەسەر زەویدا بگەڕێت و هیچ گوناهێکی بەسەرەوە نەمێنێت).

لە توندترین جۆرەکانی بەلا ئەوەیەکە خوای گەورە بەندەکەی توشی بەلاو ئێش و ئازار بکات لەلاشەیدا، وەك لە چیرۆکی ئەیوب ﷺ دا هاتووە ئەو بەلایانەش لە چاکەی دونیا و قیامەتە هەروەك تەڵقی کوڕی حەبیب ﷺ دەفەرموێت: "أربع من أوتيهنَّ أوتي خير الدنيا والآخرة: من أوتي لساناً ذاكراً وقلباً شاكراً

---

الشيخ الألباني في: (صحيح الترمذي) (١٩٥٦)، و(صحيح ابن ماجة) (٣٢٤٩)، و(السلسلة الصحيحة) (١٤٣)، و(المشكاة) (١٥٦٢)، و(صحيح الجامع) (٩٩٢).

(٩٦) أخرجه: الترمذي (٢٣٩٨)، وابن ماجة (٤٠٢٣)، واحمد (١/١٨٥)، والحاكم (١/٤٨)، والدرامي (٢/٣٢٠)، والبيهقي (٣/٣٧٢)، وابن حبان (٢٩٠١) وقال محققه: إسناده حسن ، وصححّه الشيخ الألباني في (صحيح الترمذي) (١٩٥٦)، و(صحيح ابن ماجة) (٣٢٤٩)، و(السلسلة الصحيحة) (١٤٣)، و(المشكاة) (١٥٦٢)، و(صحيح الجامع) (٩٩٢).

وبدناً على البلاءِ صابراً وزوجة مؤمنة لا تبغهِ في نفسها خوناً"[٩٧] "چوار شت هەر کەسێك پێی ببەخشرێت ئەو کەسە چاکەی دونیاو قیامەتی پێ بەخشراوە: هەر کەسێك زوبانێکی بەزیکرو دڵێکی بەشوکرو لاشەیەکی بە ئارامگر لەسەر بەڵا و خۆڕاگرو خێزانێکی باوەڕداری هەبێت کە خیانەت لە نەفس و مێردی و خۆی نەکات".

**١٢- ئارامگرتن لەسەر ئارەزووەکانی نەفس:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴾ (الأنبیاء: ٣٥) (هەموو کەسێک دەبێت مردن بچێژێت ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە ناخۆشی و بەڵاوە بەخێرو خۆشی، سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە (تا پاداشتتان بدەینەوە)). **وەخوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا لِنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَرِزۡقُ رَبِّكَ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ ﴾ (طـه: ١٣١).((ئەی بڕوادار تۆ چاوەکانت مەبڕە ئەو نازو نیعمەتەی کە هەندێک خەڵکمان لێ بەهرەمەند کردووە، کە جوانی و ڕازاوەی ژیانی دنیایە، بۆ ئەوەی تاقیانبکەینەوە، بێگومان ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارت (لە بەهەشتدا) چاکترو بەردەوامترە).

**وەخوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾ (النازعات: ٤٠ -٤١).(بەڵام ئەوەی لە پایەو شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست* جێی ئەوانە بێگومان بەهەشتە جێی مانەوەو حەوانەوەی).

**لەبەر ئەمەیش حەسەنی کوڕی صالح** (رحمه الله) **دەفەرموێت: لە تەفسیری** ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة: ٢٤)

---

(٩٧) أخرجه: ابن أبي شيبة في (المصنف) (٣٥١٤٧).

اي: (صبروا عن الدنيا)[٩٨] واته: "ئێمه ئه‌وانمان كرده پێشه‌وا وبانگخواز به‌هۆی ئارام گرتنیانه‌وه له‌سه‌ر ئاره‌زووه‌كانی دونیا تا خه‌ڵكی ڕێنمونی بكه‌ن بۆ فه‌رمانه‌كانی ئێمه".

ئیبن قه‌یمی جه‌وزی (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: [..الصَّبر على الشهوة أسهل من الصبر على ما توجبه الشهوة فإنها إما أن توجب أَلَماً وعقوبة وإما ان تقطع لذة أكمل منها وإما ان تضيع وقتا إضاعته حسرة وندامةً، وإما ان تثلم عرضا توفيره انفع للعبد من ثلمه وإما ان تذهب ما بقاءوه خير له من ذهابه، وإما أن تضع قدرا اوجاهاً قيامه خيرٌ من وضعه، وإما أن تسلب نعمه بقاؤها أَلذ وأطيب من قضاء الشهوة وإما ان تطرق إليه طريقاً لم يكن يجدها قبل ذلك، وإما أن تجلب هما وغماً وحزناً وخوفاً لا يقارب لذة الشهوة، وإما أن تنسى علما ذكره ألذ مِنْ نيل الشهوة و إماان تشمت عدواً وتحزن ولياً، وإما ان تقطع الطريق على نعمة منيلة، وإما ان تحدث عيباً يبقى صفة لا تزول فإن الأَعمال تورث الصفات والأخلاق.

واعلم أن علاج كل علة بمضادة سببها: فيعالج حب الشهوات بالقناعة والصبر، وطول الأَمل بكثرة ذكر الموت][٩٩] "ئارامگرتن له‌سه‌ر ئاره‌زووه‌كان ئاسانتره له‌ئارامگرتن له‌سه‌ر پێویستی یه‌كانی ئاره‌زووكان، یا ئه‌وه‌تا ئێش و ئازار تۆڵه و سزای له دوادێت، یان ئه‌وه‌تا كات و ساتێك به‌زایه ده‌دات دوای ده‌بێته مایه‌ی ئاخ و حه‌سره‌ت و په‌شیمانی، یان ڕێز و شه‌ره‌فی كه‌سێك ده‌ڕوشێنێت كه پارێزگاری كردنی باشترو به‌سودتره بۆی یا ئه‌وه‌تا شتێكی له‌ناو ده‌بات كه‌مانه‌وه‌ی بۆ ئه‌و به‌سودتره له ڕۆیشتنی یا ئه‌وه‌تا له‌شان و شكۆ و ڕێزی كه‌سێك كه‌م ده‌كاته‌وه كه به‌رز ڕاگرتنی باشتره بۆ ئه‌و له‌و كاره‌ی، یا ئه‌وه‌تا نیعمه‌تێك له ناو ده‌با كه مانه‌وه‌ی خۆشتر و پاكتر و چاكتره له جێ به‌جێ كردنی ئاره‌زووه‌كانی، یائه‌وه‌تا

---

(٩٨) انظر: (المجالسة) للدينوري رقم (١٢١٦).

(٩٩) انظر: (الفوائد) (ص: ١٣٩).

چەندین ڕێگە دەگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکە لەوەو پێش نەیگرتۆتە بەر، یا ئەوەتا غەم و خەفەت و ترس دێنێ و دەستەبەری دەکات کە لەچاو خۆشی و ئارەزووەکەدا بەرامبەر ناکرێت، یا ئەوەتا زانست و زانیاریەك لەبیر دەکات کە مانەوە و باس کردنی زۆر خۆشترە لە گەیشتن بەو ئارەزووە، یا ئەوەتا دڵی دوژمن بەخۆی خۆشی دەکات یان دۆستێکی خەفەت بار دەکات، یائەوە تا ڕێگە دەگرێت لە گەیشتن بە نیعمەت و خۆشی یەك کە مەبەستێتی یا ئەوەتا عەیبێك دێنێتەدی لە خۆیدا کە تاریکیەکەی بەڕووخساریەوە دەمێنێت و قەد لە خاوەنە کەی لا ناچێت، چونکە کردارەکان جێگەی ڕەوشت و ئەخلاق دەگرێتەوە. بزانە چارەسەری هەموو نەخۆشیەك بە دژە هۆکارەکەی دەکرێت ئەوەتا چارەسەری خۆشەویستی ئارەزووەکان بە قەناعەت و ئارامگرتن دەکرێت، وە چارەسەری گەیشتن بە ئاواتە دوور ودرێژەکان بەباس کردن و یاد کردنی مردن دەبێت). بەهێز ترین ئارەزووەکانی دونیا ئارامگرتنە لە سەر ئافرەتان، ئەمەش نایەتە دی تەنها بە ناڕەحەتی یەکی توند و زۆر نەبێت لەبەر ئەمەشە ئیمام تاوس (رحمه الله) فەرموویەتی: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿ ..وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾ (النساء: ٢٨) (يعني: لاصبر لە عن النساء)[١٠٠] واتە: "پیاو ناتوانێت ئارامگر بێت لەبەرامبەر ئافرەتاندا".

**١٣- ئارامگرتن لەسەر وتەی دوژمنانی خوای گەورە ومیهرەبان:**

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ﴾(المزمل: ١٠). (واتە: لە بەرامبەر گوفتاری ناڕەوای خوا نەناسان هەردەم خۆڕاگر بەو بەشێوازی

(١٠٠) اخرجه: عبد الرزاق في (التفسير) (١/١٥٤) ، والطبري في (جامع البيان) (٥/٣٠) وصحح اسناده محقق كتاب (المجالسة) برقم (١٠٦٩).

جوان خۆت دوورە پەرێزگرە لێ یان). ئیبن کەثیر (رحمە الله) دەفەرموێت: "قال الله تعالى لرسوله آمِراً له بالصبر على آذاهم ومبشراً على صبرِهِ بالعاقبة والنصرِ والظفر"[١٠١].

"خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت و فرمانی پێ دەکات کە ئارامگربێت لەسەر ئەزیەت و وتە نابەجێکانی بێ بڕواکان، وەمـوژدەی پـێ دەدات کە لەپاداشتی ئارامگرتنیدا پاشەڕۆژ و سەرکەوتن هەر بۆ ئەو دەبێت".

### ١٤- ئارامگرتن لەسەر پارێزگاری کردنی ئاین:

ئەنەس ﷛ دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يأتي على الناس زمانٌ، الصابِرُ فيهم على دينهِ " كالقابِض على الجمر))[١٠٢]. (زەمانێك دێت بەسەر خەڵكیدا، ئارامگر تیایاندا لەسەر ئاینەکەی وەك ئەو کەسە وایە کە پشکۆیەکی ئاگرینی بەمشت گرتبێت).

وەلەڕیوایەتێکی تردا... دەفەرموێت: ((...إِنَّ مِنْ ورائكُمْ أيامُ الصَّبر، الصَّبر فيهن على مثل القبضِ على الجمر، للعامل فيهنَ مثلُ أجر خمسين رجلاً يعملون بمثلِ عملِهِ))[١٠٣] (لە دوای ئێوە ڕۆژانی ئارامگرتن دێت، ئارامگرتن لەو ڕۆژانەدا وەك ئەو کەسەیە پشکۆی ئاگرینی لەمشتدا بێت، ئەو کەسەی لەو ڕۆژانەدا کاری چاکە ئەنجام بدات پاداشتی بەوێنەی پەنجا کەسە کە وەك ئەو کاردەکەن).

ئیبن مەسعودە ﷛ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: [((إِنَّها ستكون بعدى أثرةٌ، وأمورٌ تُنكرونها)) قالوا: يا رسول الله فما تأمرنا ؟ قال: ((تُؤدون

---

(١٠١) (تفسير القرآن العظيم) لابن كثير (١٢٥/٥)

(١٠٢) اخرجه: الترمذي (٢٢٦٠) وقال: حديث غريب، وَصَحَّحَه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (١٨٨٤)، وفي (السلسلة الصحيحة) (٤٩٤).

(١٠٣) أخرجه: ابن ماجة (٤٠٤١)، وصَحَّحَه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (٣٢٤٢)، وفي (السلسلة الصحيحة) (٤٩٤).

الحَقَّ الذي عَلَيكم، وتسألون الله الذي لكم))][١٠٤] (ئێوە لەدوای من بێبەش دەکرێن و چەندە ئاکاری درێو دەبینن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی فەرمانمان پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ئەرك و مافەکانی سەر شانتان جێ بەجێ بکەن، وداوای مافەکانتان تەنها لەخوا بکەن).

لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیر ﷺ دەفەرموێت: (پیاوێك لە یاریدە دەدەران) (الأنصار) وتی: [یا رسول الله: ألا تستعملني كما استعملت فُلاناً ؟ فقال: ((إنكم ستلقون بعدي أثرةً، فاصبروا حتى تلقوني على الحوض))][١٠٥] (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نام خەیتە سەر ئیش و کار هەر وەك فلان کەست خستۆتە سەر ئیش وکار؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئێوە لە دوای منی ماف خوراو دەبن و بێ بەش دەکرێت لە مافەکانتان ئێوەش ئارام بگرن تا ئەو کاتەی دەگەنەوە بە من لەسەر حەوز).

بەڵێ هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەم کارەیان ئەنجامداوە و جێ بەجێ یان کردووە محمدی کوڕی مونکەدیر دەفەرموێت: "لما بويع ليزيد بن المعاوية ذكر ذلك لابن عمر ﷺ فقال: ان كان خيرا رضينا وان كان شرا صبرنا"[١٠٦] ". "لە کاتێکدا بەیعەت درا بەیەزیدی کوڕی موعاویە ئەمە باس کرا لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ و ئەویش فەرمووی: گەر چاکە کاربێت ئەوا پێی ڕازین وە گەر خراپە کاربێت ئەوا ئارامگردەبین بەرامبەری".

---

(١٠٤) اخرجه: البخاري (٧٠٥٢)، ومسلم (١٨٤٣)، الترمذي (٢١٩٠)، واحمد(٣٨٤/١)، البيهقي(١٥٧/٨).

(١٠٥) اخرجه: البخاري (٣٧٩٤)، واحمد(١١١/٣)، أبو يعلى (٣٦٤٩).

(١٠٦) اخرجه: ابن ابي شيبة في (المصنف) (١٠٠/١١) ، وابن سعد في (الطبقات) (٨٢/٤) ، و الداني في (الفتن) (١٤٥): وقال محققه: اسناده صحيح.

**١٥- ئارامگرتن ومانه‌وه له‌سه‌ر ڕێبازی هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌رﷺ:**

* ئیبن مه‌سعود ﷺ ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ كه فه‌رموویه‌تی: ((المتمسك بسنتي عند اختلاف امتي كالقابض على الجمر))[١٠٧] (ئه‌وه‌ی ده‌ست ده‌گرێت به سوننه‌تی منه‌وه له‌كاتی جیاوازی ئومه‌ته‌كه‌م وه‌ك ئه‌و كه‌سه وایه پشكۆی ئاگری له‌ناو مشتدا گرتبێت). ئیمامی (مه‌ناوی) له لێك دانه‌وه‌ی ئه‌م فورمووده‌یه‌دا ده‌ڵێت:" (شبه رسول الله ﷺ المعقول بالمحسوس اي: ان الصابر على احكام الكتاب والسنة يقاسي بما يناله من الشدة والمشقة من اهل البدع والضلال مثل ما يقاسيه من ياخذ النار بيده ويقبض عليها بل ربما كان اشد، وهذا من معجزاته فانه اخبار عن غيب وقد وقع)، وقال ابو عبيد القاسم بن سلام: (المتبع للسنة كالقابظ على الجمر وهو اليوم عندي أفضل من الضرب بالسيوف في سبيل الله"[١٠٨]. " پێغه‌مبه‌ر ﷺ ته‌شبیهی نه‌بینراوی كردووه به‌شتێك كه بینراوه: ئه‌و كه‌سه‌ی ئارامگره له‌سه‌ر یاساكانی قورئان و سوننه‌ته‌كانی پێغه‌مبه‌ر توشی ناڕه‌حه‌تی ئازاری سه‌رلێ شێواوی زیادكه‌ر له نایینی خوا و گومڕایان ده‌بێت وه‌ك ئازاری كه‌سێك ئاگر به‌ده‌ستی هه‌ڵگرێت له‌ناو مشتیدا بیگرێت یاخود له‌وه‌ش سه‌خت تر". ئه‌مه‌ش له موعجیزه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوایه ﷺ چونكه باسكردنی شتێك كه‌نه‌بووه و دواتر هاتوونه ته‌دی.

وه ئه‌بو عوبه‌یدی كوڕی قاسمی كوڕی سه‌لام ده‌فه‌رموێت: "ئه‌و كه‌سه‌ی شوێن كه‌وته‌ی سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره ﷺ وه‌ك ئه‌وه وایه كه پشكۆ و چلۆسكی ئاگرینی به‌ده‌سته‌وه بێت، وه ئه‌و كاره ئه‌مڕۆ به‌لای منه‌وه زۆر گه‌وره‌تره له‌لێدانی شمشێر له پێناوی خوای گه‌وره‌دا". وه‌حومه‌یدی ده‌فه‌رموێت:"والله لان أغزو هؤلاء

(١٠٧) اخرجه: الحكيم في (النوادر) ، وحسنه الشيخ الالباني في (السلسلة الصحيحة) (٩٥٧) ، و (صحيح الجامع) (٦٦٧٦).

(١٠٨) انظر: (تاريخ بغداد) (١٢/٤١٠) ، و (تاريخ دمشق) (٤٩/٧٩).

الذين يردون حديث رسـول الله ﷺ أحـب إلـيَّ مـن أن أغـزو عـدَّتهم مـن الأتـراك"[١٠٩].

"وه‌للاهی گـه‌ر دژایـه‌تی ئـه‌و که‌سـانه بکـه‌م که‌فـه‌رمووده‌کانی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ڕه‌ت ده‌که‌نه‌وه له‌لام خۆشه‌ویست تر وچاکتره له‌وه‌ی که غه‌زا له‌گه‌ڵ تورکه‌کان بکه‌م".

وه ده‌رباره‌ی ئه‌م باسه دووباره یه‌حیای کوڕی یه‌حیا ده‌ڵێـت: "الذَبُّ عن السـنة افضـل مـن الجهـاد"[١١٠] "پارێزگـاری و بـه‌رگری کـردن لـه سـوننه‌تی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ گه‌وره‌تره له جیهاد وتێکوشان له‌پێناوی خوادا". وه‌ئـیبن قـه‌یم (رحمه الله) ده‌ڵێـت: "الجهاد بالحجة واللسان مقدم على الجهـاد بالسـيف والسـنان"[١١١] "جیهـاد و تێکۆشـان به‌به‌ڵگه‌و زوبان له پێش تره له‌سه‌ر جیهاد کردن به شمشێر و ڕم".

* عوتبه‌ی کوڕی عه‌زوان ﷺ ده‌فه‌رموێت پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویـه‌تی: [((إنَّ مِـنْ ورائكم أَيامٌ الصَّبر، للمتمسك فِيهنَ يَومئذ بِما أنتم عَليه أَجرُ خمسين مِنْكُمْ)) قـالوا: يـا نبـي الله أومنهم ؟ قال: ((بَلْ مِنكُمْ))][١١٢] (سات و ساڵانێکی ئارامگرتن دێت لـه‌دوای ئێـوه ئه‌و که‌سه‌ی له‌و ڕۆژه‌دا یاساو ڕێبازی ئێستای ئێوه پیا ده‌بکات ئه‌وانـه پاداشـتی پـه‌نجا کـه‌س لـه ئێـوه یـان بـۆ ده‌نوسـرێت. وتیـان: ئـه‌ی پێغه‌مبـه‌ری خـودا ﷺ پاداشتی په‌نجا که‌سی له خۆیان ؟ فه‌رمووی: به‌ڵکو په‌نجا که‌س له ئێـوه). بـه‌ڵام هـاوه‌ڵانی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ له‌سـه‌ر هاوه‌ڵایـه‌تیان له‌گـه‌ڵ پێغه‌مبـه‌ر ﷺ پلـه وریـز وپاداشتی گه‌وره‌یان لای خوا هه‌یه. که‌هیچ موسـوڵمانێك لـه دوای ئـه‌وان ناتوانێت

---

(١٠٩) انظر: (ذم الكلام) للامام الهروي (٢٢٨).

(١١٠) انظر: (ذم الكلام) للامام الهروي (١١١).

(١١١) انظر: (شرح القصيدة النونية) (١٢/١).

(١١٢) أخرجـه: الطبرانـي في (الكـبير) (١٧ /٢٨٩)، وصـَّحَحَه الشـيخ الألبـاني في (السلسـلة الصحيحة) (٤٩٤).

بگاتە پلە و پایەی ئەوان و هەركەسێك شاخێك ئاڵتون لە ڕێی خوادا ببەخشێت ناگاتە تەنها مشتێكی ئەوان).

وەئیمامی ئەوزاعی (رحمه الله) دەفەرموێت: "اصبر نفسك على السنة وقف حيث وقف القوم وقل بما قالوا وكُف عما كفوا عنه"[113] (ئارامگربە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وە بووەستە لەو باسانەدا كە هاوەڵان تیایدا وەستاون وەخۆت بەدوور گرە لەو باسانەی كە ئەوان خۆیانیان لێ بەدوور گرتووە).

**١٦- ئارامگرتن لەسەر كوشتن و كوشتار لە پێناوی خوادا:**

خودا گەورە ومیهرەبات داوای ئارامگرتمان لێ دەكات لە كاتی جیهاد وتێكۆشاندا لە پێناو ئاینی خوادا هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿...رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴾ (الأعراف: ١٢٦).(خودای ئێمە خۆگری و ئارامیمان بەسەردا بڕێژەو بە موسوڵمانێتی بمانمرێنە). ئەمەش دوا وتەی ئەو ساحیرو جادوگەرانەی فیرعون بوو لە دوای تەوبەو گەڕانەوەیان بۆ لای خوادا و بڕوا هێنانانیان بە پێغەمبەرایەتی (موسى و هاورون) (عليهما الصلاة والسلام).ئەمەش وتەی ئەوان بوو لەدوای هەڵواسینیان و پاشان شەهیدیان كردن.

طەبەری (رحمه الله) دەڵێت: "قالوا:رَبَنا انزل علينا صبراً يحبسنا عن الكفر بك عند تعذيب فرعون إيّانا واقبضنا إليك على الإسلام"[114]. "وتیان: ئەی خوای گەورە ئارامی و خۆ ڕاگرتنێكمان پی ببەخشە كە دوورمان خاتەوە لە كوفر لە كاتی ئازاردانمان

---

(١١٣) اخرجه: البيهقي في (المدخل) (٢٣٣) ، واللالكائي في (شرح الاعتقاد) (١/١٥٤) ، والآجري في (الشريعة) (ص:٥٨)، وصحح اسناده الشيخ علي حسن في (علم اصول البدع)(ص:١٣٨)

(١١٤) انظر: (جامع البيان) (٦/٣٢).

لەلایەن فیرعەونەوە، وەگیانمان لێ بسێنەوە وبمان مرێنە لەسەر ئاینی ئیسلام".
خوای گەورە پاڵپشتی یانی کرد وبەبڕواداریەوە گەڕانەوە لای خوا.

لە باسی سەربازەکانی طالوتدا دەفەرموێت: ﴿...قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٤٩). (ئەوانەی دڵنیا بوون کە بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چونکە چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خودا، خوای گەورەش یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە).

## لێرەدا چەندەها نموونە و فەرموودە هەن لەم باسەدا لەوانە:

(١) عائیشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((قتل الصَبرِ لا يَمُر بذنب إلا محاه))[١١٥] (کوشتنی بە ئارامی گشت گوناهەکان دەسڕێتەوە) لێرەدا مەبەست لە کوشتنێك ئارامی تێدا بێت ئەوەیە کەسێك بەندو زنجیرکرابێت لەبەردەم خەڵکی دا پاشان لەبەر چاویاندا بکوژرێت، ئا لەم ڕووە وە زیادی کوڕی عەمر دەڵێت: "کلنا نکره الموت وألم الجراح ولكنا نتفاضل بالصبر"[١١٦] "هەموومان مردن ئازاری بریندابوونمان پێ ناخۆشە بەڵام جیاوازیمان هەیە لە ئارامگرتندا".

(٢) ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: [ان رسول الله ﷺ قام فيهم، فذكر لهم ان الجهاد في سبيل الله والإيمان بالله أفضل الأعمال، فقام رجل فقال يا رسول الله، ارأيت انْ قتلت في سبيل الله، أتكفر عني خطاياي؟ فقال له رسول الله ﷺ: ((نعم انْ قتلت في سبيل الله وأنت صابر محتسب، مقبل غير مدبر)) ثم قال رسول الله

(١١٥) أخرجه: البزار (١٥٤٥)، وصَحَّحَه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٠١٦).
(١١٦) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٤٩).

ﷺ:کیف قلت؟ قال:أرايت إن قتلت في سبيل الله، أتكفر عني خطايا ى؟ فقال رسول الله ﷺ: ((نعم، ان قتلت في سبيل الله وأنت صابر محتسب مقبل غير مدبر، إلا الدَّين، فإن جبريل عليه السلام قال لي ذلك))][117]. (پێغەمبەری خودا ﷺ لەناوماندا هەستایە سەرپێ و باسی ئەوەی بۆ کردین کە جیهاد و تێکۆشان لەڕێگەی خوادا، وەباوەڕبوون بەخوا گەورەترین کرداری چاکەیە کەمرۆڤ بیکات، پیاوێك هەستایە سەر پێ و وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە پێناوی خوادا بکوژرێم ئایا دەبێت بەمایەی ئەوەی گوناهەکانم بسڕێتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر بکوژرێیت لە پێناوی خوادا و ئارامگرو خۆڕاگر بیت و ئومێدی پاداشتت لای پەروەردگارت هەبێت و پشت نەکەیتە دوژمن و لەپێشەوە بکوژرێیت. لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی چیت وت ؟ وتی: ئەگەر بکوژرێم لە پێناوی خوادا ئایا دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر بکوژرێیت لە پێناو خوادا و ئارامگربیت و ئومێدی پاداشتی هەبێت لای خوا و پشت نەکاتە دوژمن و لەپێشەوە نەکوژرێت جگە لە قەرزار، چونکە جبریل ئەمەی پێ ڕاگەیاندم).

﴿٣﴾ سوهەیب ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((كان ملك فيمن كان قبلكم وكان له ساحر .........فأمر بالآخدود بأفواه السكك فخدت وأضرم فيها النيران وقال: من لم يرجع عن دينه فأقحموه فيها أو قيل له اقتحم، ففعلوا، حتى جاءت امرأة ومعها صبى فتقاعست أن تقع فيها، فقال لها الغلام: يا أمه اصْبري، فأنك على حق))[118] (لە پێش زەمانی ئێوەدا پادشایەك ساحیرێکی هەبوو....هتد. پاشان

---

(١١٧) أخرجَهُ مسلم (١٨٨٥)، والترمذي رقم (١٧١٢) ، والنسائي (٦/٣٤)، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح النسائي) (٢٥٩٨)، و(صحيح الترمذي) (١٣٣٩)، و(الارواء) (١١٩٧).

(١١٨) اخرجه: مسلم (٣٠٠٥)، احمد (٦/١٧) برقم (٢٣٩٣) وقال محققه الأرناؤوط إسناده صحيح، الترمذي (٣٣٤٠)، الطبراني في (الكبير) (٧٣٢٠) ، و ابن حبان (٨٧٣) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في: صحيح الترمذي (٢٦٦٠).

فرمانی كرد به‌هه‌ڵكه‌ندنی چاڵێك له‌ قه‌راغ شاردا، هه‌ڵیان كه‌ند و ئاگریان تێ به‌ردا، وتی: هه‌ركه‌سێك له‌ ئاینه‌كه‌ی په‌شیمان نه‌بووه‌وه‌ بیكه‌نه‌ ناو ئاگره‌كه‌وه‌، یان وتیان به‌ پادشا كه‌سێك وازی نه‌هێنا بیكه‌ره‌ ناو ئاگره‌كه‌وه‌، پادشاش ئه‌نجامی دا، تاوه‌كو ئافره‌تێك هات و منداڵێكی له‌گه‌ڵ بوو ته‌مبه‌ڵی و سستی كرد له‌ خۆفرێدانه‌ ناو ئاگره‌كه‌وه‌ منداڵه‌كه‌ش به‌دایكی وت ئه‌ی دایكه‌ ئارام بگره‌، به‌ڕاستی له‌سه‌ر حه‌قی).

﴿٤﴾ئه‌بو ده‌رداء ده‌گێڕێته‌وه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌ فه‌رموویه‌تی: ((ثلاثة يحبهم الله ويضحك اليهم ويستبشر بهم: الذي اذا انكشفت فئة قاتل وراءها بنفسه لله عز وجل فاما ان يقتل واما ان ينصره الله عز وجل ويكفيه، فيقول (اي: الله تعالى): انظروا الى عبدي هذا كيف صبر لي بنفسه...))[119] (سێ كۆمه‌ڵ هه‌ن خوای گه‌وره‌ خۆشی ده‌وێن پێده‌كه‌نێت بۆیان و به‌مژده‌ ده‌بێت بۆیان، ئه‌وه‌ی كاتێك كۆمه‌ڵه‌كه‌ی له‌گۆڕه‌پانی جه‌نگدا هه‌ڵدێن ئه‌و ڕانا كات و له‌ڕووی دوژمندا ده‌وه‌ستێت و به‌جه‌نگ دێت تا ده‌كوژرێت یان خوای گه‌وره‌ ده‌یپارێزێت و سه‌ری ده‌خات به‌سه‌ر دوژمندا خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: ته‌ماشای ئه‌و به‌نده‌یه‌م بكه‌ن چۆن له‌به‌ر من ئارامی گرت به‌گیانی خۆی).

﴿٥﴾ عه‌بدوللای كوڕی ئه‌بو ئه‌وفا ﷺ ده‌فه‌رموێت: [ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌ هه‌ندێ له‌و ڕۆژانه‌ی كه‌ ده‌گه‌یشت به‌ دوژمنان چاوه‌ڕوانی ده‌كرد تاوه‌كو خۆر هه‌ندێك لایده‌دا پاشان، هه‌ڵده‌ستا له‌ ناو هاوه‌ڵاندا و ده‌یفه‌رمووی: ((يا أيها الناس لا تتمنوا لقاءَ العدو واسألوا الله العافية، فإذا لقيتموهم فاصْبروا، واعلموا أن الجَنة تحت ظلال

(١١٩) اخرجه: الطبراني في (الكبير) (١١٨٩١) ، وحسنه الشيخ الالباني في: (صحيح الترغيب والترهيب) (٦٢٥).

السيوف)) ثم قال النبي ﷺ ((اللهم منزل الكتاب ومجري السحاب، وهازم الأحزاب اهزمهم وانصرنا عليهم))][١٢٠]. (ئه‌ی خه‌ڵكینه ئاواتی گه‌یشتن به دوژمن و ڕووبه‌ڕووبونه‌وه‌یان مه‌خوازن، داوا له خوا بكه‌ن ساغ و سه‌لامه‌ت بن كاتێكیش گه‌یشتن به دوژمن ئارامگربن، و بزانن به‌هه‌شت له ژێر سێبه‌ری شمشێر دایه. پاشان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی ئه‌ی خوای دابه‌زینه‌ری (القرآن) وه‌هێنه‌ری هه‌ور و باران، وبه‌زێنه‌ری گشت گرۆهه‌كان بیان به‌زێنه و سه‌رمانبخه به‌سه‌ریاندا).

ئارامگرتن هه‌رده‌م هۆكاری سه‌ركه‌وتن بووه.ئه‌بو ڕه‌بیعی كوڕی حه‌ڕاش ده‌فه‌رموێت عومه‌ری كوڕی خه‌طاب ؓ كۆمه‌ڵێك له گه‌وره پیاوانی تیره‌ی بنی عه‌بس هاتن بۆ لای و پێی فه‌رموون: (.....بم كنتم تغلبون الناس؟، قالوا: بالصبر لم نلق قوماً إلاّ صبرنا لهم ما صبروا لنا....)[١٢١]. (به‌چی ئێوه زاڵده‌بوون و سه‌رده‌كه‌وتن به‌سه‌ر خه‌ڵكیدا ؟ وتیان: به‌ئارامگرتن ئێمه ڕووبه‌ڕووی هه‌ر كۆمه‌ڵێك وه‌ستابین تا ئه‌وان ئارامگربووبن له ڕووماندا ئێمه‌ش ئارامگربووین له ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌یاندا).

### ١٧- ئارامگرتن له‌سه‌ر پێشه‌وا وكاربه‌ده‌ستی سته‌مكارو زاڵم:

ئیبن عه‌باس ؓ ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه فه‌رموویه‌تی: ((من رأى من أميره شيئاً يكرهه فليصبر))[١٢٢]. (هه‌ركه‌سێك له پێشه‌واكه‌یدا شتێكی بینی كه پێی ناخۆش بوو با ئارام بگرێت). ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك ؓ فه‌رمووی گه‌وره پیاوانمان له هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویان: ((لا تسبوا امراءكم ولا تغشوهم ولا

---

(١٢٠) أخرجه: البخاري (٢٩٣٣)، ومسلم (١٧٤٢)، أبو داود (٢٦٣١)، الترمذي (١٦٧٨)، ابن ماجة (٢٧٩٦)، والبيهقي (٩/١٥٢)، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح أبي داود) (٢٢٩٠)، و(صحيح الترمذي) (١٣٧١)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٢٥٥)، و(صحيح الجامع) (٢٧٥٠).

(١٢١) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٩٢).

(١٢٢) اخرجه: البخاري (٧١٤٣-٧٠٥٤) ، ومسلم (١٨٤٩).

تبغضـوهم واتقـوا الله واصـبروا فـأن الأمـر قريـب))[١٢٣]. (ئێـوه جـوێن مـه‌ده‌ن بـه پێشه‌وایانتان و به‌ر چاو ڕه‌شیان مه‌كه‌ن و فێڵیان لـێ مه‌كـه‌ن و مـه‌یان بـوغزێنن و ڕقتان لێیان نه‌بێت، خواپه‌رست بن و ئارامگربن تاخوا كاره‌كان دێنێته پێش).

زوبه‌یری كوڕی عوده‌ی ده‌فه‌رموێت: هاتین بۆ لای ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك ﷺ: (فشكونا اليه ما يلقون من الحجاج فقال: ((إصبروا فإنه لايأتي عليكم عام ولا يـوم إلاّ والـذي بعده أشد منه حتى تلقوا ربكم)) سمعته من نبـيّكم)[١٢٤]. (سـكالای خۆمـان كـرد لای ئـه‌و سه‌باره‌ت به‌و سته‌م و ناڕه‌حتیانه‌ی حه‌جاج ده‌یكات به‌رامبـه‌ر خـه‌ڵكی. ئه‌نه‌سـش ﷺ فه‌رمووی: (ئارام بگرن به‌ڕاستی ساڵ له‌دوای ساڵ و ڕۆژ له دوای ڕۆژ كـه دێـت ناڕه‌حه‌ت تر ده‌بێت تا ده‌گه‌نه‌وه به خوای خۆتان، ئه‌مه‌شـم لـه پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌تان بیستووه).

به‌صیری كوڕی عه‌مر (رحمه الله) ده‌فـه‌رموێت: [(أن أبـا مسـعود الأنصـاري لمـا قتـل عثمان ﷺ أحتجب في بيته فدخلتُ عليه فسألتهُ، أو قال فسُأل عن أمـر النـاس فقـال: (عليـك بالجماعة فإن الله لن يجمع أمة محمد ﷺ على ضـلالة واصـبر حتـى يسـتريحَ بـرٌّ و يُسـتراح مـن فاجر)، ومن ذلك أيضا قول سعيد بـن عبـد العزيـز (أذا رأيـت أمـراً لاتسـتطيع تغـيره فاصـبر وانتظر فرج الله تعالى)][١٢٥] (ئه‌بو مه‌سعودی ئه‌نصاری له‌كاتێكدا عوسمان ﷺ كـوژرا له‌ماڵه‌كـه‌ی خۆیـدا خـۆی شـارده‌وه و چـومه لای و پرسـیارم لێ كـرد یـان وتـی پرسـیاریان لێ كـرد ده‌ربـاره‌ی كاروبـاری خـه‌ڵكی ئـه‌ویش وتـی: هه‌میشـه له‌گـه‌ڵ

---

(١٢٣) اخرجه: الطبراني في (الكبير) (٧٦٠٩) ، والبيهقي في (الشعب) (٧٥٢٣) ، وابن ابـي عاصـم في (السنة) (١٠٤٩) وقال محققه الشيخ الالباني اسـناده حسـن ، وابـو عمـر الـداني في (الفـتن) (١٤١) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٢٤) أخرجه: البخاري (٨/٨٩) في كتاب الفتن ، وأحمد في (المسند) (١٢٨١٧) واللفظ له.

(١٢٥) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا(١٠) و(٨٧).

کۆمەڵدا بەو تاك مەکەوە بەڕاستی خوای گەورە ئومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گومڕایی کۆناکاتەوە، ئارام بگرە تا وەکو چاکەکار پشوو دەدات لەدەستی وخراپکاریش خەڵکان لەدەستی ڕزگاری دەبێت).

وەلەم بارەیەوە دووبارە سەعیدی کوڕی عەبدول عەزیز (رحمه الله) دەفەرموێت: "هەرکاتێك فرمان کارێکت بینی و نەت توانی بیگۆڕیت ئارام بگرە و چاوەڕوانی کردنەوەی قاپی خۆشی و فەرەحی خوای گەورەبکە".

وە ئیمام ئەحمەد دەربارەی ئارامگرتن بەدەستانەوە کار بەدەستانەوە و بێ فرمانی نەکردنیان دەفەرموێت: "الصبرُ على ما نحن فيه خيرٌ من الفتنة"[١٢٦]. "ئارامگرتن لەوحاڵەی کە ئێمەی تێدایە چاکترە لە بەڵاو ناخۆشی و کارەسات) هەر کاتێك موسوڵمان ئەوەی کرد خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە وشکۆداری دەکات بە هۆی ئەو زوڵم و زۆرەی کە لێی دەکرێت".

ئەبو کەبش ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ثلاث أقسم عَليهن وأُحدثكم حديثاً فاحفظوه: ((ما نقص مال عبد من صدقة، ولاظُلم عبد مظلمةً صَبر عليها الآزاده الله عزاً......))[١٢٧] (سێ شت سوێندی لەسەر دەخۆم و بۆتانی باس دەکەم لەبەری کەن: ماڵ و سەروەتی مرۆڤ بەخێر و چاکە کەم ناکات، هەر بەندەیەك هەر جۆرە ستەمێکی لێ بکرێت بەڵام ئەو ئارامگربێت خوای گەورە لەسەر ئەو کارەی زیاتر سەربەز و شکۆدار تری دەکات....).

---

(١٢٦) أخرجه: الخلال (السنة) (١٣٢/١) وصحح إسناده: عبد الله برجس في (الأمر بلزوم جماعة المسلمين) (ص: ٧٩).

(١٢٧) أخرجه: احمد (٢٣١/٤) ، والترمذي (٢٣٢٥) ، وابن ماجة (٤٢٢٨) ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (١٤).

پێویسته لەسەر موسوڵمان دووربکەوێتەوه و تێکەڵاوی ستەمکار و خراپەکار نەکات بائارام بگرێت لەسەر کەنارگرتن و خۆدوورخستنەوه لێ یان مەگەر بەرژەوەندی و قازانجێکی شەرعی لەتێکەڵا وبوونیاندا هەبێت، وه یەحیای کوڕی موعاز (رحمه الله) (وهو من تبع الأتباع) دەفەرموێت: (الصبر "على الخلوة من علامة الإخلاص" [١٢٨]. "ئارامگرتن لەسەرکەنارگیری و گۆشەگیری لە نیشانەی دڵسۆزی و نیەت پاکی یە".

**١٨- ئارامگرتن لەکاتی توڕەبووندا:**

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((لَيس الشديد بالصرعة، إنما الشَد يد الذي يملك نفسه عند الغضب)) [١٢٩]. (بەهێز و بەتوانا ئەوە نیە کەخەڵکی دەدا بە زەویدا، بەڵکو بەهێز و بەتوانا ئەوەیە کەخۆی بۆ بگیرێت لەکاتی توڕەبووندا).

سولەیمان کوڕی سورد ﷺ دەفەرموێت : كنت جالساً مع النبي ﷺ ورجلان يستبان وأحدهما قد إحمرَّ وجهه، وانتفخت أوداجه، فقال رسول الله ﷺ: ((إني لأعلم كلمة لو قالها لذهب عنه ما يجد لو قال:أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ذهب عنه ما يجد)) فقالوا له: ان النبي ﷺ قال: ((تعوذ بالله من الشيطان الرجيم)) [١٣٠]. (من دانیشتبووم لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ، دوو پیاو دەمەقاڵەیان بوو یەکێکیان دەم و چاوی سور هەڵگەڕا بوو وه دەمارەکانی لاملی گرژبوو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (من وشەیەك دەزانم گەر بیڵێیت ئەو توڕەیی یەی نامێنێت گەر بڵێت پەنادەگرم بەخوا

---

(١٢٨) انظر: (سير السلف الصالحين) للامام ابي الفضل الاصبهاني (١٢٠٣/٣) ، و (طبقات الصوفية) للسلمي (ص: ١٩٠).

(١٢٩) اخرجه: احمد (٢٣٦/٢) ، والبخاري (٥٢/٨) ، ومسلم (٢٦٠٩).

(١٣٠) اخرجه: احمد (٣٩٤/٦) ، والبخاري (٦١١٥) ، ومسلم (٢٦١٠) ، وابو داود (٤٧٨١).

لەشەیتانی نەفرەت لێکراو، ئەو کات ئەو تورەیی یەی کەهەیەتی نامێنێت دواجار بە کابرا یان وت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی ڕەجم کراو).

* موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((مَنْ كَظم غَيضاً وهو قادر على أنْ ينفذه دعاه الله سبحانه على رؤوس الخلائق يوم القيامة حَتى يُخيره من الحور العين ما شاء))[١٣١]. (هەر کەسێك خەشم و ڕق و قینی خۆی بخواتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا توانای هەبێت جێبەجێی بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بانگی دەکات لە پێش چاوی هەموو دروست کراوەکاندا تا سەر پشکی بکات کام لە حۆریەکان هەڵبژێرێت بە ویستم و ئارەزووی خۆی).

وە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە ئەشەجی کوڕی عەبدول قەیسی ﷺ فەرمووی: ((ان فِيكَ خَصلتين يحبهما الله:الحلم والأناة))[١٣٢]. (دوو ڕەوشتی جوان لە تۆدا هەیە خوای پەروەردگار خۆشیانی دەوێت، لەسەر خۆیی و ئارامگرتن وهەڵنەچوون).

برای بەڕێزم بەڕاستی تورەیی دەرد و نەخۆشی یەکە لە نەخۆشی یەکان، و تورەیی گرۆ بڵێسە و کڵپەیەکی ئاگرینە، ئادەمیزاد لەکاتی تورەییدا ڕەگێك و ڕەوشتێکی شەیتانانەی تێدا دێتە دی و کرداری شەیتانی ئەنجام دەدات، لە هۆکارەکانی تورە بوون، لە خۆڕازی بوون، وگاڵتە کردن، ودژایەتی، وناپاکی و هەرناپاکی، وهەڵپەکردن بۆ بەدەست هێنانی ماڵی زیادەو پلەو پایەی بەرز، ئەم

---

(١٣١) اخرجه: ابن ماجة (٤١٨٦) ، والترمذي (٢٤٩٣) ، وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣٣٧٥) ، و (صحيح الجامع) (٦٥٢٢).

(١٣٢) اخرجه: مسلم (٢٠١١) ، وابو داود (٥٢٢٥) ، و الترمذي (٢٠٩٧) ، وابن ماجة (٤١٨٨)، وانظر (صحيح الترمذي) (٦١٣٦).

ڕه‌وشتانه خراپ و که‌م بایه‌خ و لۆمه‌کراون له‌ڕووی شه‌رعه‌وه، پێویسته گشت که‌سێك ڕێگری له‌م ڕه‌وشته خراپانه بکات به‌وشتانه‌ی که پێچه‌وانه یانن و پێویسته هۆکاره‌کانی دروست بوونی تۆڕه‌بوون نه‌هێڵێت و هۆکاره‌کانی ئارامگرتن له‌سه‌ر هه‌موو جۆره‌کانی به‌ڵاو نه‌هامه‌تی پیاده بکات.

**وه چاره‌سه‌ری توڕه‌یی:** به دوو ڕێگه ده‌بێت:

**یه‌که‌م: به خۆپاراستن:** ئه‌مه‌ش دێته دی به خۆ پاراستن له هۆکاره‌کانی توڕه‌یی بوون له‌و هۆکارانه‌ش: خۆ به‌زلزانین و له خۆ ڕازی بوون، وه‌شانازی کردن و هه‌ڵپه‌کردنێکی نا په‌سه‌ند، وه گاڵته‌و گه‌پێك که جێگه‌ی خۆی نه‌بێت، وه‌هاو وێنه‌ی ئه‌وانه.

**دووه‌م: چاره‌سه‌رکردنی دوای که‌وتنه ناو توڕه‌بوونه‌وه، ئه‌ویش به کورتی له‌چوار شت دایه:**

١- په‌نا گرتن به خوای گه‌وره و میهره‌بان له شه‌یتانی ڕه‌جم کراو.

٢- ده‌ست نوێژ گرتن.

٣- گۆڕانکاری کردن له‌و شێوازه‌ی که له‌کاتی توڕه‌بووندا هه‌یه، گه‌ر به‌پێوه‌بووی دانیشه، وه‌گه‌ر دانیشتبووی پاڵ بده‌ره‌وه وه‌گه‌ر له ماڵ بوی بچۆده‌ره‌وه، وه‌یان خۆت بگره وهیچ مه‌ڵی وه‌ك له فه‌رمووده‌که‌دا هاتووه: ((إذا غضبت فاسكت))[١٣٣] (هه‌ر کاتێك توڕه‌بووی بێ ده‌نگ به) وه‌جگه له‌مانه چه‌ندین ڕێ و شوێنی تر هه‌یه.

٤- ئه‌و پاداشتانه بخه‌ره پێش چاوی خۆت که پێت ده‌به‌خشرێت له‌سه‌ر توڕه‌نه‌بوونت که بۆت ئاماده‌کراوه وه‌ئه‌و تۆڵه و سزایانه‌ش بخه‌ره پێش چاوی

---

(١٣٣) انظر: (صحيح الادب المفرد) رقم (٦٩٣).

خـۆت کـە بـۆت ئامـادەکراوە لەسـەر توڕەبوونـت وە بزانـە لەوکاتـەدا لێـت بەتوڕەیە)[١٣٤].

**١٩- ئارامگرتن لەکاتی ئاژاوە و نەچوونە ناوی:**

ئەبو زەڕ ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((یا ابـاذر)) قلـت: لبيك يارسول الله وسعديك، قال: ((كيف أنـت إذا أصـاب النـاس مـوت يكـون البيـت (اي: القبر) فيه بالوصيف [أي: العبد والأمة])) ؟ قلت: الله ورسوله اعلم. قـال: ((عليـك بالصـبر)) أو قال ((تصبر)) وفي رواية: ((أولا أدلك على خير من ذلك: تصبر حتى تلقاني)) ثم قال لـي: ((يا أبا ذر))؟ قلت لبيك وسعديك، قال: ((كيف أنت إذا رأيت أحجـار الزيـت (وهـو مكـان قرب المدينة) قد غرقت بالدم))؟ قلت: ماخار الله لي ورسوله، قـال: ((عليـك بمـا أنـت منـه)) قلت: يارسول الله افلا آخذ سيفي واضعه على عاتقي ؟ قال ((شاركت القوم إذن)) قلت: فمـا تأمرني ؟ قال: ((تلزم بيتك)) قلت: فان دخل عليَّ بيتي ؟ قال: ((فان خشيت أن يبهرك شعاع السيف فألقِ ثوبك على وجهك يَبُؤْ بإثمك وإثمِهِ))[١٣٥]. (ئەی ئەبو زەڕ وتم فـەرموو ئـەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کامەران بیت فەرمووی: (تۆ چـۆن دەبیـت کاتێـك خـەڵکی مردنێکیان تـوش دەبێـت گـۆڕ تیایـدا بەکۆیلـە و خزمـەتکار دەگۆڕدرێتـەوە؟ وتم: خـواو پێغەمبـەری خـوا زانـاترن. فـەرمووی ئـارام بگـرە وە لەڕیوایـەتێکی تـردا فەرمووی: ئاگادارت بکەمەوە لەوە چاکتر چیە تۆ ئارام بگرە تا دەگەیتەوە بـەمن، لەپاشان پێی فەرمووم ئەی ئـەبا زەڕ؟ وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی:

(١٣٤) انظر: (مختصر منهاج القاصدين)(ص:١٧٨-١٨٤) ، و (آفات اللسان)(ص:١١٠-١١٢)، و (الحكمة في الدعوة الى الله) (ص:٦٤-٦٦).

(١٣٥) اخرجـه: احمـد (٢١٣٢٥) وقـال محققـه: إسـناده صـحيح علـى شـرط مسـلم ورواه بـرقم (٢١٥٥٨) ، و أبـو داوود (٤٢٦١) ، وابـن ماجـة (٣٩٥٨) ، وصـححه الشـيخ الالبـاني في (الارواء) (٢٤٥١) ، و (صحيح ابن ماجة) (٣١٩٥) ، و (صحيح ابي داوود) (٣٥٨٣).

هەر کامەران بیت تۆ چۆن دەبیت کاتێك کە ئەحجارو زەیت(کە شوێنێکی نزیکە لە مەدینە) نوقم ببێت لە خوێندا؟ وتم خواو پێغەمبەری خوا چ چاکە ئەوەم بۆ بکەن، فەرمووی ئاگاداری ئەوەبە کە پێشتر لەسەری بووی (کە ئارامگرتنە)، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا شمشێرەکەم هەڵنەگرم و لەسەر شانم داینێم ؟ فەرمووی: (کەواتە:بەشداری ئەوانت) کرد وتم تۆ فرمانم بەچی پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (کەنار گربە لە ماڵەکەی خۆتدا) وتم ئەی گەر یەکێك لەوانە هاتە ناو ماڵەکەمەوە ؟ فەرمووی: ئەگەر ترسایت تیشکی شمشێرەکەی ئاوی چاوت بەرێ و بتۆقیت تۆ پۆشاکەکەت بدە بەسەر دەم و چاوتدا تا ئەو گوناهبار ببێت و گوناهەکانی تۆش لەگەردنی ئەو بێت).

وە دەربارەی ئەم باسەش ئەبو دەرداء ﷺ دەفەرموێت: ((إنە ستکون أمور تنکروها، فعلیکم فیها بالصبر، صبرٌ کقبض علی الجمر ولاتقولوا (نُغیّر) حتی یکون الله یغیر))[١٣٦]. (لەمەودوا چەندەها کار دێتە پێش کە ئێوە بەلاتانەوە نا پەسەند دەبێت، ئێوە لەوکاتەدا ئارام بگرن، ئارامگرتنێك وەك چلۆسکی ئاگر بەدەستەوە گرتنە ئێمە، نەڵێن دەیگۆڕین تا خوای گەورە خۆی دەیگۆڕێت.

**٢٠- ئارامگرتن لەسەر گەڕان بەدوای زانستدا:**

پێویستە لەسەر خوازیاری زانست ئارام بگریت لەسەر گەڕان بەدوای زانست و فێربووندا، کەسێك بەشەعبی (رحمه الله) وت: "من این لك هذا العلم کله ؟ قال: بنفی الاعتماد، والسیر في البلاد، وصبر کصبر الجماد، وبکور کبکور الغراب"[١٣٧]. " تۆ لە کوێ ئەم هەموو زانست و زانیاریەت هێنا ؟ وتی بە پشت نەبەستن بە هیچ

---

(١٣٦) انظر: کتاب (الصبر) لابن أبي الدنیا (١٥٢).

(١٣٧) انظر: (تذکرة الحفاظ) (٨١/١).

كەسێك، وە بەگەڕان لە شارەكاندا، وەبەئارامگرتن وەك ئارامی بـێ گیـان و بـەرد، وەبە زوو هەستان و دەرچوون وەك هەستانی قەلەڕەش".

وە ئیمامی شافعی (رحمه الله) دەفەرموێت: (حق على طلبة العلم بلوغ غاية جهدهم في الاستكثار من العلم والصبر على كل عارض دون طلبه وقال: لا يُدرك العلـم إلا بالصـبر علـى الذل)(١٣٨). (پێویستە خوازیارانی زانست ئەو پەڕی هەوڵ و كۆششی خۆیـان بكـەن بۆ زۆر بەدەست هێنانی زانست و ئارامگرتن لەسەر ئەو هەموو لەمپەڕانـەی دەبنـە ڕێگر لە فێربوونی زانست و زانیاریدا، وەفەرمووی زانست بەدەست نایەت تەنها بە ئارامگرتن لەسەر بێ دەسەلاتی و كەساسی بەدەست دێت دەفەرمووی:

اصبر على مُرّ الجفا من معلم ... فـان رسـوب العـلم في نفراته
ومن لم يَذُق ذُلَ التعلم ساعة ... تَجرّع ذُلَ الجهل طوال حياته(١٣٩)

واتە: ئارامگرە لەسەر تاڵی گوێ پێنەدانی مامۆستا چونكە نـەمانی زانسـت لـە دوور كەوتنەوەدایە لـە مامۆسـتا وزانسـت هەركەسـێك سـاتی كەساسـی فێربـوونی زانست نەچێژێت دەبێت تاڵی كەساسی نەزانین بەدرێژای ژیانی بچێژێت.

ئێمە ئامۆژگاریەكی گەورە وەردەگرین لە چیرۆكی پێغەمبەر ﷺ موسى عليه السلام لە كاتێكدا داوای لە خضر كرد كە فێری بكات لەو زانیاریانەی كە خوای گەورە فێـری خضری كردبووە لە فەرموودەكەدا هاتووە كە پێغەمبـەر موسـى عليه السلام گەیشـت بـە خضر و پرسیاری لێ كرد ((جئت لتعلِّمني مما عُلِّمت رُشدا، قال الخضر: انك لن تستطيع معي صبرا، وكيف تصبر على مالم تحط به خـبرا، شـيء أُمِـرتُ بـه أنْ اَفعَلَـه إذا رأيتَـهُ لَـم تصبِرْ.... (وفي نهاية الحديث): يقول رسـول الله ﷺ: ((يـرحم الله موسـى لـوددت انـه كـان

---

(١٣٨) انظر: (المجموع) (المقدمة) (١/٣٠).

(١٣٩) انظر: (ديوان الشافعي) (ص/١٦).

صبر حتى يَقُصَّ علينا من اخبارهما))[١٤٠]. (هاتووم تا فێرم بکەیت لە زانیاریانەی کە خوا فێری کردوویت، خضر فەرمووی تۆ ناتوانی لەگەڵمدا خۆڕاگر و ئارامگر بیت، چۆن ئارام دەگریت لەسەر ئەو شتەی کە زانیاری یەکی تەواوت نیە بەسەریدا، چەندەها کار فەرمانم پیّ کراوە بیکەم گەر جیّ بەجیّ ی کەم و بیبینی تۆئارام ناگریت.... لە کۆتایی فەرموودەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ڕەحمەتی خوا لە موسی بێت خۆزگە ئارامی بگرتایە تاوەکو هەواڵ و زانیاری یەکانیان بۆ ئێمە باس بکردایە). وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت ((رحمة الله علينا وعلى موسى لو صبر لرأى من صاحبه العجب))[١٤١]. (ڕەحمەتی خوا لە ئێمەو موسی بێت ئەگەر ئارامی بگرتایە ئەوا شتی زیاتر سەرسوڕهێنەری لە هاوەڵەکەی دەبینی).

## ٢١- ئارامگرتن لەسەر ئازاری دراوسیّ:

ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ثلاثة يحبهم الله... والرجل يكون له الجار يؤذيه جاره، فيصبر على اذاه حتى يُفرِّق بينهما موت او ظعن))[١٤٢]. (سیّ کۆمەڵ هەن خوای گەورە خۆشیانی دەوێت... پیاوێك دراوسیّ یەکی هەبێت کە ئازاری بدات و ئەو ئارام بگرێت لەسەری تاوەکو جودایی دەکەوێتە نێوانیان بە هۆی مردن یان کۆچ کردنەوە)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((ان الله عزوجل يحب ثلاثة...... ورجل كان له جار سوء يؤذيه فيصبر على أذاهُ [ويحتسبه] حتى

---

(١٤٠) اخرجه: البخاري (٦١١٣) ، ومسلم (٦١١٥).

(١٤١) اخرجه: الطبري في (جامع البيان) (١٧٥١٣) ، والحاكم في (المستدك) (٤١٤٩) ، و صححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٣٥٠١).

(١٤٢) اخرجه: احمد (١٥١/٥) ، وابن ابي شيبة (٣٠٢/٥) ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٣٠٧٤٢) ، و(المشكاة)(١٩٢٢).

یكفیه الله إیّاهُ بحیاةٍ أو موتٍ [أو حادثٍ]))[١٤٣] (خوای گەورە سێ كۆمەڵی خۆش دەوێت.. لەوانە پیاوێك دراوسێ یەكی خراپی هەبێت و ئازاری بدات بەڵام ئەو ئارام بگرێت لەسەری، وەچاوەڕێ پاداشتەكەی بێت لای خوای گەورە تا خوای گەورە ڕزگاری دەكات لەو كەسە بە ژیان بێت یان بە مردن بێت یان بەڕووداوێك بێت).

طەحاوی (رحمه الله) لە لێك دانەوەی مانای ئەم فەرموودەیە دا دەفەرموێت: "فتأملنا هذا الحدیث من الصبر على الجار السوء فوجدنا من حق الجار على جاره اكرامه إیّاه، فاذا منعه وخلطه باذاه إیّاه وصبر على ذلك واحتسبه كان في حكم من غلب على حق له فاحتسبه، ومن كان كذلك أحبّهُ الله عز و جل لأنهُ مِن أهل طاعته والتمسك بما امر به"[١٤٤].

"وردبوینەوە لەم فەرموودەیەدا كەباس لە ئارامگرتن دەكات لەسەر دراوسێی خراپ لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ دەركەوت یەكێك لەمافەكانی دراوسێ بەسەر دراوسێكەیەوە ئەوەیە كەڕێزی لێ بگرێت، هەر كاتێك ئەو كەسەش بە ئازار نەبوو بەرامبەر دراوسێ خراپەكەی و ئارامی گرت لەسەری و ئومێدی پاداشتی لای خوای پەروەردگاری هەبوو، ئەو كات ئەو كەسە وەك یەكێك وایە كە مافی هەبێت بەسەر بەرامبەرەكەی، بەڵام بەرامبەرەكەی ئەو مافەی لێ قەدەغە بكات، هەر كەسێك بەم شێوەیە ڕەفتار بكات خوای گەورە خۆشی دەوێت چونكە لەو كەسانەیە كە گوێ ڕایەڵی ئەون و دەستیان گرتووە بەوەی كە فرمانیان پێ كراوە".

---

(١٤٣) اخرجه: الحاكم في (المستدرك) (٨٩/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والطحاوي في (مشكل الاثار) (١٨/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٢٥٦٩).

(١٤٤) انظر: (مشكل الاثار) للطحاوي (١٨/٤).

# سودەکانی ئارامگرتن

**١- ئارامگران پاداشتی هەرە گەورەیان بۆ دەستەبەرە:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ (القصص: ٥٤).(ئەوانە دووجار پاداشتیان پێدەدرێت بە هۆی خۆگری و ئارام گریانەوە، بە چاکەش بەرهەڵستی خراپە دەکەن، ئەوانە هەروەها لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە پێمانداون دەبەخشن) .

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ ...وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل: ٩٦).(**...پاداشتی ئارامگران دەدەینەوە بە چاکتر لە کردەوەکانی خۆیان). وە خوای گەورە دەفەرموێت:**﴿ ...إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (الزمر: ١٠) (بەڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە).

**لە ڕیوایەتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما أعطي أحدٌ عطاءً خيراً وأوسع من الصبر)).[١٤٥] (هیچ کەسێك خەڵات نەکراوە بە خەڵاتێك چاکتر و فراوان تر بێت لە ئارامگرتن). هەروەها دەفەرموێت: ((إنَّ عِظم الجزاءِ مع عِظمِ البلاءِ، وأنَّ الله تعالى إذا أحبَّ قوماً ابتلاهم، فمن رضي فله الرّضا، ومن سَخِط فله السُخط))[١٤٦] (پاداشتی گەورەی لەگەڵ بەڵا و موسیبەتی گەورە دایە، وەخوای گەورە هەر کەسانێکی خۆی خۆش ویست توشی ناڕەحەتی و بەڵا و موسیبەتی دەکات، هەر**

---

(١٤٥) أخرجه : البخاري (٦٤٧٠)، و مسلم (١٠٥٣).

(١٤٦) أخرجه: الترمذي (٢٣٩٨) وقال: حديثٌ حسن ، و ابن ماجة (٤٠٣١)، وحَسنه الشيخ الألباني في: (صحيح الترمذي) (١٩٥٤)، (صحيح ابن ماجة)، رقم (٣٢٥٦)، و(السلسلة الصحيحة) (١٤٦).

کەسێ بەو بەڵایە ڕازی بێت ئەو کەسە ڕازی بوونی خوای بۆ هەیە، وە هەرکەسێکی ناڕازی بێت بەو بەڵایە ئەو کەسە ناڕازی بوونی خوای گەورەیی بۆ هەیە).

سوفیانی سەوری (رحمه الله) دەفەرموێت: "انما الاجر علی قدر الصبر" (١٤٧) (پاداشت ئەندازەی ئارامگرتنە).

وە سولەیمانی کوڕی قاسم (رحمه الله) دەفەرموێت: [ كل عمل يعرف ثوابه إلاّ الصَّبر قال الله تعالى﴿ ...إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (الزمر: ١٠) قال كالماء المنهمر](١٤٨) (هەموو کردارێك پاداشتەکەی دەزانرێت جگە لە ئارامگرتن). خوای گەورە دەفەرموێت (تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە). فەرمووی: (پاداشتەکەیان وەك بارانی بەخوڕەم وایە).

٢- ئارامگران دەگەن بە پلە و پایەی سەرکەوتووان و ڕزگاربووان:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ٢٠٠) (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆگربن و خۆڕاگریی ئارامگریی بەسەر خۆتاندا بهێنن، نەبەزن لە خۆگری و مانەوەتان لە سەنگەردا، هەوڵ بدەن هەمیشە لە سەنگەری خەبات و کۆششدا بن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بۆ ئەوەی سەرفرازیی (هەمیشەیی) بەدەست بهێنن) . (خوای گەورە ڕزگاربوونی لەم ئایەتەدا پەیوەست کردووە بە کۆمەڵێك کردارەوە).

---

(١٤٧) انظر: (سير السلف الصالحين) للامام الاصبهاني (١٠٠٥/٣).

(١٤٨) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٢٠)، و(عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين) لابن القيم (ص: ٦٩).

ئیبن قەیمی جەوزی (رحمه الله) دەفەرموێت: [ وَعلَّمَ سبحانه عبادَه كيفية الحرب والجهاد فجمعها لهم في أربع كلمات لا يتم أمر هذا الجهاد إلا بهذا الأمور الأربعة:

فلا يتم الجهاد إلا بمصابرة العدو، وهي مقاومته ومنازلته، فإذا صابر عدوه احتاج إلى أمر آخر وهي المرابطة وهي لزوم ثغر القلب وحراستهِ لئلا يدخل منه العدو، ولزوم ثغر العين والأذن واللسان والبطن واليد والرجل، فالمرابطة لزوم هذه الثغور، ولا يخلى مكانها فيصادف العدو الثغر خالياً فيدخل منه ... وجماع هذه الثلاثة وعمودها الذي تقوم به هو تقوى الله تعالى، فلا ينفع الصبر ولا المصابرة ولا المرابطة إلاّ بالتقوى ولا تقوم التقوى إلا على ساق الصبر][١٤٩]. "خوای گەورە بەندەکانی فێری چۆنێتی خەبات و تێکۆشان کردووە لە چوار وشەدا کۆی کردۆتەوە، وەجیهاد کردن نایەتەدی بەبێ ئەم چوار کردارە نەبێت جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا کاملْ و تەواو نابێت تەنها بەئارامگرتن و خۆڕاگری نەبێت بەرامبەر بە دوژمن، ئەویش بەبەرەنگاری و بەرگری کردن و جەنگ کردن دەبێت، هەرکاتێك لەڕووی دوژمنەکەی ئارامگربوو پێویستی بە فرمانێکی تر دەبێت ئەویش پابەند بوونە بە جێگەی پاسەوانی و چاودێری تا دوژمن نەیەتە ناوەوە لەکاتی جەنگا لەپێناوی خوای پەروەردگاردا، وە پابەند بوونی چاو و گوێ و زوبان و دەست و پێ و سکە تاوەکو کەلێنێك بەدیار نەکەوێت لەو حەواس و ئەندامانی جەستەی غافلْ نەبێت و شوێنەکەی چۆلْ نەکات نەوەك لەو کەلێنانەوە بچێتە ژوورەوە.... وە کۆکەرەوەی ئەم سێ خاڵە وە ئەو کۆڵەکەیەی کە لەسەری ڕاوەستاوە بریتیە لە تەقوای خوای گەورە، وە ئارامگرتن و بەرگری و جەنگ کردن و تێکۆشان و ئێشك گرتن لە پێناوی خوا تەنها بە تەقوا و خوا ناسی دەبێت وەتەقواش ڕاناوەستێ تەنها لەسەر قەدی ئارامگرتن نەبێت".

---

(١٤٩) انظر: (الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي) (ص: ١١٣).

**٣- ئارامگران دەگەنە پلەو پایەی پێشەوایان:**

**خوای گەورە ستایشی ئارامگران دەکات و ئەوانی کردووەتە پێشەوای خەڵکی بۆ ڕێگەی خواناسی و چاکە کاری خوای گەورە لەبارەی بەنی ئیسرائیلەوە دەفەرموێت:** ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة: ٢٤). (پاشان کە نەوەی ئیسرائیل خۆگری و ئارامیان کردە پیشەیان کردمانن بە پێشەواو دەسەڵاتمان پێبەخشین، ئەو کاتە دڵنیایی و بڕوایەکی تەواویان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە (شایستەی ئەو ڕێزە بوون).

**خوای گەورە باسی ئارامگرتن و خۆڕاگری پێغەمبەران دەکات سەلات و سەلامی خوایان لێبێت و دەفەرموێت:** ﴿ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴾ (الأنبياء: ٨٥) ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ... ﴾ (الأحقاف: ٣٥) (ئەی پێغەمبەر ﷺ دان بەخۆدا بگرەو خۆڕاگربە، هەروەکو پێغەمبەرانی خاوەن ویستی بەهێز خۆڕاگر بوون...). **کەوا بوو بە ئارامگرتن و دڵنیا بوون لەبەڵێنەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ دەگەیت بەپلەی پێشەوایی لە ئایندەدا.**

**ڕێگەی خواناسی کەسانی ئارەزووباز و گومڕا و بەگومانەکان لێ دوورن تەنها ئارامگران وبڕواداران لەسەری دەڕۆن و بەردەوام دەبن وئەوان وەك چاو ساغ و ڕێ نیشاندەر وان).**

**٤- ئارامگران خوای گەورەیان لەگەڵدایە:**

**ئارامگران زیاد لەوەش پشت گیری دەکرێن خوای گەورەش لەگەڵیاندایە، خوای گەورە لە دوو جێگەدا دەفەرموێت:** ﴿ ...إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ (الأنفال: ٤٦) **وەخوای گەورە دەفەرموێت** ﴿ ...إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ (البقرة: ١٥٣). **(خودا لەگەڵ ئارامگرانە).**

ئـەبو عـەلی دەقـاق دەفـەرموێت: "فـاز الصـابرون بعـز الـدارين لأنهـم نـالوا مـن الله معيتهُ"[١٥٠] "ئـارامگران سـەرکەوتوون بـە پايەبـەرزی و گـەورەیی دونیـا و قیامـەت چونکە ئەوان لەلایەن پەروەردگارەوە گەیشتوون بەو پلەیەی کە هـەردەم خوایـان لەگەڵە دایە".

**٥- ئارامگران خاوەنی موژدەی هەرە گەورەن:**

خوای گەورە سێ کاری کۆی کردۆتەوە بۆ ئارامگران کە بۆ هیچ کەسێکی تـری کۆنەکردۆتەوە جگـە لـەوان، ئـەویش سـەڵەوات دانـی خـوای پـەروەردگارە لەسـەر ئـەوان، وە ڕەحمـەت و بـەزەیی خـوای گەورەیـە بـۆ ئـەوان، وەڕێنمـونی کـردن و هیدایـەتی خوایـە بـۆ ئـەوان وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴾ (البقرة: ١٥٥ – ١٥٧). (سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچوونی بەرو بوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن... * کە ئەوانەن هەر کاتێك تووشی بەڵاو ناخۆشیەك دەبن دەڵێن: ئێمە موڵکی خواین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەر ئەنجامیش تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان. * ئا ئەوانە چەندەها ستایش و ڕەحمەت و میهرەبانی بەسەر ئەواندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن کە ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە).

ئیبن عەباس رضي الله عنه لەبارەی ئەم ئایەتـەوە دەفـەرموێت﴿ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴾ قال: [أخبر اللهُ أن المؤمنِ إذا سلمَ الأمرِ للهِ ورجـعَ واسـترجعْ عنـد

(١٥٠) انظر: (عدة الصابرين) (ص: ٦٩)، و(مدارج السالكين) (٢/١٦٦).

المصيبة كتبَ اللهُ لَهُ ثلاثُ خصِال مِنْ الخير:- الصلاةُ مِن الله، والرحمة، وتحقيق سبيل الهُدى وقال رسول اللهﷺ: (مِن استرجَع عند المصيبة جبَّر اللهُ مصيبتهُ، واحسن عقَباهُ وجعلَ لَهُ خلفاً صالحاً يرضاهُ)](١٥١) "خوای گەورە هەواڵمان دەداتێ کاتێ بڕوادار کردارەکانی دایە دەست پەروەردگاری و تەنها گەڕایەوە بۆ لای ئەو لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا خوای گەورە سێ ڕەوشتی جوانی بۆ دەنوسێت لە چاکە:

١- سەڵاوات دان لەسەری لەلایەن پەروەردگارەوە.

٢- ڕەحمەتی خوای پەروەردگار.

٣- ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدات و دەیخاتە سەری.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە لە کاتی توش بوونی بەڵا و ناخۆشی دا، ئەو کەسە خوای گەورە قەرەبووی بەڵا و ناخۆشی یەکەی بۆ دەکاتەوە، وەپاشەڕۆژ و عاقیبەتیشی بەخەیر و چاکە دەگێڕێت وەچاکتر لەوەشی پێ دەبەخشێت کە لەدەستی چووە و ڕازیشی دەکات.

٦- ئارامگران یارمەتی خوایان بۆ مسۆگەرە:

بەئارامگرتن زاڵ دەبین بەسەر هەموو ناڕەحەتی و گیروگرفت و ستەم و ناخۆشی یەکاندا. خوای گەورە ئارامگرتنی کردووەتە پاڵپشت و یارمەتی و فرمانی پێ کردووین ئارامگرتن بکەینە یارمەتیدەری هەموو ساتەکانمان و فەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ (البقرة: ١٥٣). (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خوا بکەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژ کردنەوە، و دڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە).

---

(١٥١) اخرجه: البيهقي في (شعب الإيمان) برقم (٩٦٨٩).

هه‌ر كه‌سێك ئارامگر نه‌بێت یارمه‌تی دانی بۆنی یه‌. عه‌بدوللای كوڕی سه‌لام ﷺ ده‌فه‌رموویت: ((كان النبي ﷺ إذا نَزلتْ بأهلهِ شِدةٌ أو ضيق أمرهم بالصلاةِ وقرأ ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ... ﴾ (طه: ١٣٢))[١٥٢]. (پێغه‌مبه‌ر ﷺ هه‌ركاتێك ته‌نگ و چه‌ڵه‌مه‌یه‌ك بكه‌وتایه‌ ناو ماڵ و منداڵی یان نه‌بوونی و نه‌داری ڕووی تێ بكردایه‌ فرمانی پێ ده‌كردن كه‌ نوێژبكه‌ن وه‌ ئه‌و ئایه‌ته‌ی بۆ ده‌خوێندنه‌)وه‌: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ... ﴾.

**٧- ئارامگران سه‌ركه‌وتنیان بۆ ده‌سته‌ به‌ر ومسۆگه‌ره‌:**

خوای گه‌وره‌ به‌ئارامگری وته‌قوای كردبوونه‌ته‌ مه‌رجی سه‌ركه‌وتن ده‌فه‌رموێت: ﴿ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴾ (آل عمران: ١٢٥). (به‌ڵێ گه‌ر خۆڕاگر بن و پارێزكار بن هه‌ر ئێستا دێن بۆ لاتان و په‌روه‌ردگارتان پێنج هه‌زار فریشته‌ی نیشانه‌دارتان بۆ ڕه‌وانه‌ ده‌كات، بۆ ئه‌وه‌ی كۆمه‌كیتان بكه‌ن).

وه‌پێغه‌مبه‌ریش ﷺ ده‌فه‌رموێت: ((...واعْلَمْ إنَّ النّصْرَ مَعَ الصَّبر...))[١٥٣]. (باش بزانه‌ سه‌ركه‌وتن له‌گه‌ڵ ئارامگرتندایه‌) ئا له‌مه‌وه‌ ده‌زانین كه‌ خوای گه‌وره‌ به‌ڵێنی سه‌ركه‌وتنی داوه‌ به‌بڕواداران هه‌ر كاتێك ئه‌وان پابه‌ندبن به‌ئارامگرتنه‌وه‌، ئه‌ویش ئه‌و وشه‌ جوان و به‌ڵێنه‌ گه‌وره‌یه‌ كه‌پێیان به‌خشرا خوای گه‌وره‌

(١٥٢) اخرجه: الطبراني (الأوسط) (٨٨٦) وقال محققه/ اسناده حسن، والبيهقي (شعب الإيمان) (٩٧٠٥) وصححه السيوطي-كما في (فتح القدير) (٣/٥٥٩) وقال محقق فتح القدير: إسناده صحيح.

(١٥٣) أخرجه: أحمد (٢٦٦٩) و (٢٨٠٤) وإسناده صحيح كما قال الشيخ الأرناؤوط في تخريج (رياض الصالحين) رقم (٦٢). وصححه أيضاً الشيخ الألباني في: (السلسلة الصحيحة) (٢٣٨٢).

دەفـەرمویت.﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا ﴾ (الأعـراف: ١٣٧)
(بەڵێنی ڕاست و جوانی پەروەردگارت (ئەی محمد ﷺ) جێبەجێ بوو بۆ نەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی کە ئارامیان لەسەرگرت، (کەواتە ئەگەر ئوممەتی تۆیش ئاوا خۆگربن بێگومان هەمان ئەنجام بەدەست دەهێنن) **کەوا بوو ئارامگرتن کلیلی سەرکەوتن و خۆشی یە لە دوای ناخۆشی وەك وتراوە:(الصبر مفتاح الفرج)[١٥٤]. (واتە ئارامگرتن کلیلی خۆشی و لابردنی ناڕەحەتی یەکانە).**

**٨-ئارامگران پارێزراون لەپیلان وفێڵی دوژمنانیان:**

**خوای گەورە ئارامگرتن و تەقوای کردووتە قەڵغانێکی زۆر گەورە لەفێڵی دوژمنان، بەندەی بڕوادار هیچ قەڵغانێکی گەورەی وەك قەڵغانی ئارامگرتن و تەقوای بەدەست نەهێناوە خوای گەورە دەفەرمویت:**﴿ وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا ۗ إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾ (آل عمران: ١٢٠). (خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشییەکتان بۆ پێش بێت، ئەوان پێی دڵخۆش دەبن، جا ئەگەر خۆگر بن و پارێزکار بن، پیلان و تەڵەکەی ئەوانە هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت، چونکە بەڕاستی خوا دەوری پیلان و پیلان گێڕانی داوەو بە ئاگایە لە هەموو کارو کردەوەو نەخشەکانیان).

**٩-ئارامگران فریشتەکان سلاّویان لێ دەکەن لەبەهەشتدا:**

**خوای گەورە ومیهرەبان هەواڵمان دەداتێ کە فریشتەکان سلاّو دەکەن لە بڕواداران لە کاتێکا دەچنە بەهەشت ئەوەش بە هۆی ئارامگرتنیانەوەیە هەروەك دەفـــەرمویت:** ﴿ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ ۖ وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ

---

(١٥٤) وقد ورد ذلك مرفوعا وهو ضعيف لايصح انظر: (المقاصد الحسنة) (٢٩٠) ، و (اتحاف السادة) (٦/٩) ، و (كشف الخفاء) (١٥٩٠) ، و (الدرر المنتثرة) (١٠٤).

عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴾ (الرعـــــد: ٢٣ - ٢٤). (کــــە باخەکانی بەهەشتی_عەدن_ بۆیان ڕازاوەتەوە، بە شادیەوە دەچنە ناوی، هاوڕێ لەگەڵ هەر کەسێك چاك و پاك و خواناسە لە باووباپیران و هاوسەرانیان و نەوەکانیان، جا فریشتەکان دەچن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەکانەوە.... * دەڵێن: سڵاوتان لێ بێت بە هـۆی خۆگرتنتانـەوە (لـە بەرامبـەر کێشـەکانی ژیـان، لەبەرامبـەر گاڵتـەجاڕیی خوانەناسان...) کەوابوو ئای چەندە جێگە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد.)

**١٠- ئـارامگران پاشـەڕۆژ و ئـەنجامێکی زۆر چـاك و جـوان و بـەئاکام چـاوە ڕێیانە:**

**ئارامگرتن چاکەیەکی گەورە بـۆ خاوەنەکـەی، ئاکـامێکی جـوان و چـاکتری بـۆ دەستبەر دەکات لە دونیا و قیامەتدا، خوای گەورە بۆ بڕواداراني بـەڕەوا دانـاوە تۆڵـەو سـزای خۆیـان بسـێنن لەوانـەی سـتەمیان لـێ کـردوون بـە ئەنـدازەی تاوانەکانیان، لەپاشان خوای پەروەردگار سوێند دەخوات و دڵنیامـان دەکاتـەوە لـەوەی کـە ئـارامگرتن بـۆ ئـەوان چـاکترە هـەر وەك دەفـەرموێت:** ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴾ (النحـل: ١٢٦).(ئەگـەر ویستتان تۆڵە بکەنەوە، دەبێت هەر بەقەدەر ئەو ستەمەی کە لێتان کراوە تۆڵە بکەنەوە، خۆ ئەگەر ئارام گرو خۆگر بن، ئەوە چاکترە بۆ ئارامگرو خۆگران). **بـیر بکـەرەوە و وردبەرەوە لەم دووپات کردنەوە بەسوێند خواردنێك کە ئامـاژە دەکـات لەسـەری، و دوو پاتی دەکاتەوە.**

ئیبن عه‌باس ﷺ ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ که فه‌رموویه‌تی: ((... اعلم اِن في الصبر على ما تكره خيراً كثيراً واعلم ان النصر مع الصبر ...))[١٥٥]. (باش بزانه به‌ڕاستی ئارامگرتن له‌سه‌ر ئه‌وشته‌ی که پێت ناخۆشه خێرو چاکه‌یه‌کی زۆری تێدایه، وه‌بزانه به‌ڕاستی سه‌رکه‌وتن له‌گه‌ڵ ئارامگرتندایه...).

له‌ئوبه‌ی کوڕی که‌عب ﷺ ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ که فه‌رموویه‌تی: [ لّما كان يوم أحد، قُتِلَ من الأنصار أربعةٌ وستون رجلاً، وَمِنْ المهاجرين ستة، فقال أصحاب رسول الله ﷺ: لَئِن كان لنا يومٌ مثل هذا مِن المشركين لنر بين عليهم. فَلما كان يوم الفتح، قال رجل ولا يعرفُ لاقريش بَعد اليوم، فنادى مُنادي رسول الله ﷺ: آمن الأسود والأبيض إلاّ فلاناً وفلاناً، ناساً سماهم، فانزل الله عز وجل:﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴾ (النحل: ١٢٦)، فقال رسول الله ﷺ: ((نَصْبِرْ وَ لا نُعاقِبْ))][١٥٦] له غه‌زای ئوحودا له یاریده‌ده‌ران شه‌ست وچوار نه‌فه‌ر کوژرا، وه له کۆچ کاران شه‌ش نه‌فه‌ر کوژرا، هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ وتیان ئه‌گه‌ر ئێمه‌ش ڕۆژێکی وه‌ك ئه‌مڕۆمان هه‌بێت بۆ کافره‌کان ده‌زانین چیان به‌سه‌ر دێنین، له کاتێکدا مه‌ککه ئازادکرا پیاوێك که نه‌زانرا کێ یه وتی قوره‌یش ئه‌مڕۆ له‌ناو ده‌چێت ئینجا پێغه‌مبه‌ر ﷺ داوای بانگده‌رێکی بانگ کرد هاوار بکات و بڵێت: متمانه‌م به‌خشیه هه‌موو ڕه‌ش و سپی پێستێك که‌سی بۆی نیی یه هیچیان به‌رامبه‌ر بکات ته‌نها فلان و فلان که‌س نه‌بێت که ناوی یان بردن خوای گه‌وره‌ش

(١٥٥) اخرجه: احمد في (المسند) (٢٨٠٣) وقال محققاه احمد شاكر ووالأرناؤوط: اسناده صحيح والحديث صحيح ، واللالكائي في (شرح الاعتقاد) (١٠٩٤) ، والبيهقي (شعب الايمان) (١٠٧٤)، والطبراني (١٢٩٨٩)، والفريابي في (كتاب القدر) رقم (١٥٥) وقال محققه: اسناده حسن.

(١٥٦) اخرجه: أحمد في (المسند) (١٣٥/٥)، وَصَّحَحَه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٢٣٧٧).

ئه‌و ئایه‌ته‌ی ڕه‌وانه کرد بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ . پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی (نصبر ولا نعاقب) ئارام ده‌گرین و تۆڵه ناسێنینه‌وه).

ئامۆژگاری و په‌ندی گه‌وره هه‌یه له چیرۆکی پێغه‌مبه‌ر ئه‌یوبی عليه السلام ئارامگردا هه‌روه‌ك له فه‌رمووده‌که‌ی پێغه‌مبه‌ردا ﷺ هاتووه: ((إنَّ نَبي اللهِ أَيوبْ لَبِثَ بِهِ بَلاؤهُ ثمانِ عشَرةَ سَنةً فَرَفضَتهُ القريبُ والبَعيدُ إلا رَّجُلينِ مِنْ إخوانه كانَا يَغدُوانِ إليهِ ويَروحان، فَقالَ أَحدُهُما لِصاحبِهِ ذاتَ يوم: تَعلم وَاللهِ لَقَد أَذنبَ أَيوب ذنباً ما أَذنَبَهُ أَحدٌ مِن العالمين فَقال لَه صاحبهُ: وَما ذاكَ ؟ قال: مُنذُ ثمانِ عشرةَ سنةً لَمْ يَرحَمْهُ اللهُ فَيَكْشِفَ ما بِهِ، فَلمَا راحَا إلى أيوب لَمْ يصبِر الرجلُ حتى ذكرَ ذلكَ لهُ، فقال أيوب: لا أدري ما تقولان غيرَ أن اللهَ تعالى يَعلمُ أَني كنتُ آمُرَّ بالرّجلين يَتَنازعانِ فَيذكرانِ اللهَ، فَارجعُ إلى بيتي فَأُكَفِّرُ عَنهُما كراهيةً أَن يُذكرَ اللهَ إلاّ في حق، قال: وكانَ يخرجُ إلى حاجتِهِ فإذا قَضى حاجتَهُ أَمْسَكَتْهُ امرأَتُهُ بيده حتى يَبلغَ، فلما كان ذات يوم أبطأَ عَليها، وأُوحى إلى أيوب اَنْ[اركض بِرجِلِكَ هذا مغتسلٌ باردٌ وَشراب] فاستبطأَتْهُ فتلقته تنظر وقد أقبل عليَها قَد اَذهب اللهُ ما بِهِ من البلاءِ وهو أحسنُ ماكان، فَلما رأَتْه قالت: اَي بارك اللهُ فيك، هل رأيتَ نبي اللهِ هذا المُبتلى ؟ وَاللهِ على ذلِكَ مَا رأَيتُ أَشبَّهَ مِنكَ إذا كانَ صحيحاً، فقال: فَإني أَنا هُو، وكان لَهُ أندران: أندرٌللِقَمحِ وأندرُ لِلشعير، فبعث اللهُ سحابَتين فلما كانتْ إحداهما على أندر القمحِ أَفرَغَت فيه الذَهَبْ حتى فاضَ وافرغتِ الأخرى في اندرِ الشعيرِ الورقِ حتى فاضَ))[١٥٧] (پێغه‌مبه‌ر ئه‌یوب عليه السلام به‌ڵاو موسیبه‌ته‌که‌ی هه‌ژده ساڵی خایاند پێوه‌ی بوو تا خزمی نزیك و دووریشی پشتیان تێ کرد و وازیان لێ هێنا

(١٥٧) أخرجه: أبو يعلى (٣٦١٧)، والبزار في (الكشف) (رقم ٢٣٥٧) (٢/٢١٥)، والحاكم(٢/٥٨١) صححه ووافقه الذهبي، وقال ابن حجر الهيثمي في (المجمع) (٨/٢٠٨): رواه أبو يعلى والبزار ورجالهُ رجالُ الصحيح، وابن حبان (٢٨٩٧) قال محققه: شعيب الأرناؤوط: إسناده على شرط مسلم. وصَّحَحَه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم (١٧).

تـەنها دوو کـەس نـەبێت لـە هـاوەڵانی بـەیانیان و ئێـواران سـەردانیان دەکـرد، یـەکێکیان ڕۆژێـك لـە ڕۆژان وتـی بـە ڕەفیقەکـەی تـری: دەزانـی ئـەیوب گونـاه و تـاوانێکی وای کـردووە هـیچ کـەس وەك ئـەو گونـاهی وای نـەکردووە لـە دونیـادا، هاوڕێ کەیشی وتی ئەو گوناهە چی یە و کامەیـە ؟ ئـەویش وتـی: ئـەوەتا مـاوەی هەژدە ساڵە خوای گەورە ڕەحمی پێ نـەکرد تـا ئـەو نەخۆشـیە لابـات لەسـەری و شـیفای بـدات و لـەو ناڕەحـەتی یـە ڕزگـاری کـات، لـە ئێوارەیەکـدا چـون بـۆ لای پێغەمبەر ئەیوب ﷺ کابرا ئارامی نەگرت و باسی ئەوەی بۆ ئەیوب ﷺ گێڕیەوە ئەیویش ﷺ فەرمووی: نازانم چی دەڵێن بەڵام خوای گەورە دەزانـێ کـە مـن ڕەد دەبـووم بـەلای دوو پیـاودا کێشـەو دەمەقاڵـەیان هـەبوو نـاوی خوایـان دەهێنـا و سـوێندیان دەخـوارد منـیش دەگەڕامـەوە بـۆ ماڵـەوە، وکـەفارەتی سـوێندی هـەر دولایانم دەدا چونکە پێم ناخۆش بوو ناوی خوا بەڕاستی بەکارنەهێنرێت. وە وتـی: ئەیوب ﷺ دەچووە سەر ئاو کاتێـك دەگەڕایـەوە خێزانەکـەی دەسـتی دەگـرت و دەیهێنایەوە شوێنی خـۆی ڕۆژێـك خێزانەکـەی دواکـەوت، خـوای گـەورە فـەرمانی وەحـی خـۆی نـارد بـۆلای ئـەیوب ﷺ کـە(لـەو ناوچـەیەدا پاژنـەی قاچـی بـدات بەزوویدا و کانیەك پڕ لە ئاو هەڵقولاَ و فەرمانی پێ کرد لێی بخواتەوە و خۆشی لێ بشـۆرێت) خێزانەکـەی سسـتی کـرد لـە هاتنـەوە بـەدوای ئـەیوب ﷺ کاتێـك خێزانەکـەی پێـی گەیشـت سـەیری دەکـرد و ئـەویش ڕووی کـردە خێزانەکـەی و لەوکاتەدا خوای گەورە هەموو بەڵاو نەخۆشی یەکەی لەسەر لابردبوو، وەزۆر جوان تر بوو لەکاتی پێش نەخۆشیەکەی، لەکاتێکدا خێزانەکەی ئـەوی بینـی پـێی وت: خـوا بەرەکـەت بکاتـە کارەکانـت ئایـا ئـەو پێغەمبـەرە نەخۆشـە گـیرۆدە بـووەت نەبینیوە؟ سوێند بە خوا هیچ کەسم نەبینیوە هاوشێوەی ئەو بێت وەك تۆ لەکاتی لەش ساغیدا، ئەیوبیش وتی: ئەوەتا من ئەوم، ئـەیوبیش ﷺ دوو کۆگـای هـەبوو

گۆگایەکیان هی گەنم بوو وە ئەوەی تریان هی جۆ بوو، خوای گەورە دوو پەڵە هەوری نارد یەکێکیان تنۆکی ئاڵتونی باراندە سەر گۆگا گەنمەکەوە بۆی پڕ کرد لە ئاڵتون وە ئەوی تریان تنۆکی زیوی باراندە سەر گۆگاکەی تری وپڕی کرد لە زیو).

وەلە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((بَينما أيوبُ يغتِسلُ عُرياناً] أُمطِر على أَيوب فراشٌ ((جَرَّاد))[١٥٨] من ذَهَبْ فَجعل يأخذهُ [في رواية]((فجعل أيوب يحشي في ثوبه، فناداه رَبُه يا أَيوب: أَلَمْ أغنيكَ عما ترى))[١٥٩] ألم أوسع عليك [قال: بلى (يا رب) ولكن لاغنى لي عَنْ رَّحمتك] في رواية [فضلك] _ [وفي رواية]لا غِنى بي عَنْ بركاتك))[١٦٠] (لەکاتێکدا ئەیوب ﷺ بەڕووتی خۆی دەشۆرد کولەی) (ئاڵتون داباری بەسەریدا و ئەویش هەڵی دەگرت)، لە گێڕانەوەیەکی تردا (ئەیوب ﷺ دەیکردەناو پۆشاکەیەوە پەروەردگارکەیەوە بانگی لێ کرد: ئەی ئەیوب ئایا بێ پێویستم نەکردوویت لەوەی کە دەیبینی، (واتە: ئەوەندەم پێ نەبەخشیویت کە پێویستیت بەهیچی تر نەبێت)، ئەویش وتی بەڵی ئەی خوای پەروەردگارم بەڵام بێ پێویست نیم لەڕەحمەتی تۆ) وە(لە زیادەو چاکە ومیهرەبانی تۆ).

---

(١٥٨) أخرجه: البخاري (٢٧٩).

(١٥٩) في رواية.

(١٦٠) أخرجه: احمد (٢/ ٣١٤، ٥١١)، و الطيالسي (٢٤٥٥)، و النسائي (١/٢٠٠)، وقال ابن كثير في (البداية والنهاية) (١/٢٠٠) إسناده على شرط الصحيح، وابن حبان (٦٢٣٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وصححهُ الشيخ الألباني في: (صحيح سنن النسائي) رقم (٣٩٦)، قال الحافظ في (الفتح) (٦/٤٢١): في الحديث جواز الحرص على الاستكثار مِن الحلالِ في حقٍّ من وثِقَ نفسه بالشكر عليه وفيه تسمية المال الذي يكون من هذه الجهة بركة ، وقال سفيان –كما في (تهذيب الكمال) (١١/ ١٦٨) ، و (تلبيس الابليس) (ص:١٨١) (ان المال كان فيما مضى يكره فاما اليوم فهو يحرسُ المؤمن).

ئا لەمەوە دەر دەکەوێت کە گەورەترین و فراوانترین بەخشندەیی ئارامگرتنە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ولن تعطوا عطاءً خيراً واوسع من الصَّبر))[١٦١]. (هیچ بە خششێکتان پێ نەبەخشراوە چاکترو فراوانتر بێت لە ئارامگرتن).وەلەگێرانەوەیەکی تردا لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەفەرموێت: ((ما أعطي أحد عطاءً خيراً وأوسع من الصَّبر))[١٦٢]. (هیچ خەلأتێك نەبەخشراوە بە هیچ کەسێك چاکتر و فراوان تربێت لە ئارامگرتن).

وەحەسەنی بەصریش (رحمه الله) دەفەرموێت: "الصبر كنز من كنوز الخير، لا يعطيه الله عَزَّ وَجَلَ إلاّ لعبد كريم عنده[١٦٣]، وكان بعض العارفين في جيبه رقعة يخرجها كل ساعة فيطالعها وفيها: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴾ (الطور: ٤٨)"[١٦٤] "ئارامگرتن گەنجینەیەکە لەگەنجینەکانی چاکە، خوای گەورە تەنها دەیبەخشێتە ئەو کەسانەی کە ڕێزیان هەیە لای). وەهەندێك لە و خواناسانە پارچەیەك کاغەزی لە باخەڵیدا بوو هەموو کات دەری دەهێنا و سەیری دەکرد وئەو ئایەتەی پێشوی لەسەر نوسرا بوو".

### ١١-ئارامگران لێخوشبوون و پاداشتی گەورە چاوەڕێیانە:

خوای گەورە لێ خۆش بوون وپاداشتی گەورە دەبەخشێت لەسەر ئارامگرتن و کرداری چاکە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ

(١٦١) اخرجه: البخاري (٦٤٧٠).

(١٦٢) اخرجه: البخاري (٦٤٧٠)، ومسلم (١٠٥٣).

(١٦٣) وقد ورد ذلك مرفوعا بلفظ: (الصبر كنز من كنوز الخير) وهذا ضعيف لايصح انظر: (اتحاف السادة المتقين) (٥/٩) ، و (تذكرة الموضوعات) (١٨٩) ، و (كشف الخفاء) (٢/٢٧) ، و (الاسرار المرفوعة) (٢٣١) ، والمغني (٣٣٥٣) ، و (موسوعة اطراف الحديث) (٥/٣٧٨).

(١٦٤) انظر: (مختصر منهاج القاصدين) (ص: ٢٦٨).

كَبِيرٌ ﴾(هود: ١١). (جگە لەو کەسانەی کە خۆگرو ئارامگر بوون و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە (لە خۆشی و ناخۆشیدا سروشتی خواناسیان ناگۆڕێت) ئا ئەوانە لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە و فراوانیان بۆ هەیە.)

**ئەوانە بەندەی جیاکراوەی خوای پەروەردگارن لە جۆرەکانی تری ئادەمیزادە لۆمەکراوەکان کە نائومێد و بێ بڕوان لە کاتی بەلا و موسیبەت و ناخۆشی یەکاندا، وە خۆ هەڵکێش و شانازی کارن لە کاتی خۆشی و بەختەوەری و بەخشندەیی دا، تەنها ئادەمیزاد بە ئارامگرتن و کرداری چاکە دەگاتە لێ خۆش بوونی پەروەردگار و پاداشتی هەرە گەورە.**

**١٢- ئارامگران جێگیر و کۆڵنەدەر دەبن:**

**خوای گەورە بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە ئارامگرتن لەو ڕەوشتە گەورانەیە کە بڕواداری پێ دەناسرێتەوە، بەڕاستی خوای پەروەردگار ئارامگرتن لەسەر بەلاو ناخۆشی یەکانی بەبەردەوام و سووربوون لەسەر کارو فرمانەکان ناو بردووە، واتە لەو کارانەیە کە مرۆڤ سور دەبێت و خۆڕادەگرێ لەسەری چونکە گرنگترین و شکۆدار ترینیانە دەفەرموێت:** ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ (الشورى: ٤٣) (لەڕاستیدا ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێت و چاوپۆشی بکات و لێخۆشبوو بێت (لەکاتێکدا کە دەتوانێت تۆڵەبسێنێت) بەڕاستی ئەوە کارێکی بەجێ و چاك و پەسەند ئەنجام دەدات، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستە بکرێت....).

**وە پێغەمبەر لوقمانیش** ﷺ **بەکوڕەکەی فەرموو:** ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ (لقمان: ١٧).

**واتە: (کوڕی خۆم نوێژەکانت جێبەجێ بکە وفەرمان بەچاکە بکە وڕێگری لە خراپە بکە و خۆگر وبەئارام بەلەسەر ئەو ناخۆشیانەی دێتە ڕێت بەڕاستی ئەوە**

کارێکی چاك و پەسەند وپێویستە ئەنجام بدرێت) ئارامگرتن کۆڵنەدانێکی پتەو و لەبن نەهاتوو بە خاوەنەکەی دەبەخشێت، وە دەبێتە هۆی دروست بوونی دڵنیایی و سەرکەوتووی، لە گشت فرمانەکانمان، ئەبو عوبەیدی کوڕی قاسمی کوڕی سەلام ﷺ دەفەرموێت: [ما أتيت عالماً قطُ فاستأذِنتُ عليه ولكن صبرتُ حتى يخرجَ اليَّ وتأولت قول الله عزوجل: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الحجرات: ٥) ][١٦٥]. "هەر کاتێك من کە دەڕۆیشتم بۆ لای زانایەك مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم لێ نەدەخواست بەڵکو ئارامم دەگرت تا دەهاتە دەرەوە بۆ لام و ئەوەم لەمانای فەرموودەکەی خوای پەروەردگار وەردەگرت کە دەفەرموێت ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ "(خۆ ئەگەر ئەوانەخۆگربوونایە، تا دەچویتە دەرەوە بۆ لایان، ئەوەچاکتر و ڕەواتر بوو بۆیان خوا لێخۆشبوو میهرەبانە).

**١٣-ئارامگران دەبنە خۆشەویستی خوای گەورە:**

خوای گەورە خۆشەویستی خۆی پەیوەست کردووە بە ئارامگرتنەوە بۆیە ئارامگران لێ ی بەهرەمەند دەبن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (آل عمران: ١٤٦) (چەندەها پێغەمبەر هەبوون کە خواناس و پیاوچاکانی زۆر لەگەڵیاندا بوو بوون و دژ بە دوژمنان جەنگاون، جا ئەوانە هیچ کات سستی و بێزاری و بێتاقەتی ڕووی تێنەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هاتووە لە پێناو ڕێبازی خوادا، لاوازو بێ هێزو سەرشۆریش نەبوون بۆ دوژمنان، خوای گەورەش ئەو ئارامگرو خۆڕاگرانەی خۆشدەوێت).

---

(١٦٥) أخرجه: الأمام الدينورى في (المجالسة وجواهر العلم) برقم (١٧٢٠).

خوای گەورەش هەر کاتێك بەندەیەکی خۆش بوێت ئەشکەنجە و ئازاری نادات و نایخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((...والله عز وجل لا يُلقي حبيبه في النار))[١٦٦]. (خوای پەروەردگاریش خۆشەویستەکەی ناخاتە ناو ئاگرەوە).

**١٤- ئارامگرتن هۆکارە بۆ بەدەست هێنانی ڕەوشتە بەرزەکان:**

خوای پەروەردگار بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ڕەوشتەبەرزەکان چاکە تەنها ئارامگران پێی دەگەن هەروەك لە قورئاندا لە دوو شوێندا باسی کردووە:

(١) لەسورەتی (القصص) لە چیرۆکی قاروندا، ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشرا وتیان بەوانەی ئاواتە خوازی ئەوە بوون ماڵ و سەروەتیان وەك قارون بێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴾ (القصص: ٨٠) (ئەوانەی کە زانست و زانیاری ڕاستیان پێبەخشراوە (دەربارەی حەڵاڵ و حەرام و نرخی قیامەت دەزانن) وتیان: هاوار بۆ ئێوە، بۆ تێنافکرن پاداشتی خوایی زۆر چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی دامەزراوی هێناوەو کارو کردەوەی چاکی ئەنجام داوە، ئەو زانست و باوەڕو کردەوەیە بە کەس نادرێت، تەنها بە خۆگرو ئارامگران نەبێت).

(٢) وەلە سورەتی (حم السجدة) دا کە ناو دەبرێت بە (فصلت) لەوێدا خوای گەورە فرمانی کردووە بە چاکەو وەڵامی خراپە بدرێتەوە، هەر کات ئەو کارە جێ بەجێ کرا ئەو کات دوژمنی سەرسەخت دەبێتە خۆشەویستێکی نزیك خوای گەروە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴾(فصلت: ٣٥) (جا کەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی کە ئارامیان گرتووە، هەروەها

---

(١٦٦) اخرجه: احمد (المسند) (١٢٠١٨) وقال محققه الشيخ الارناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأخرجه ايضاً: البزار (٣٤٧٦)، وأبو يعلى (٣٧٤٧)، والحاكم (٥٨/١).

کەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وا بنوێنێت جگە لەو کەسەی کە خاوەنی بەهرەیەکی گەورەیە).

**ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((.....و اعلم أن في الصبر على ماتكره خيرا كثيرا))[١٦٧]. (....بزانە ئارامگرتن لەسەر ئەوشتانەی کە ڕقت لێ یە و پێت ناخۆشە چاکە و خێرێکی زۆری تێدایە بۆ تۆ).**

**عوسمانی کوری حەنیفە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: [إنَّ رجلاً ضَرير البصر أتى النبي ﷺ فقال: ادعُ الله ان يعافيني. قال رسول الله ﷺ:((إن شئت دعوت وان شئت صبرت فهو خير لك))][١٦٨]. (پیاوێك سۆمای چاوی نەمابوو و نابینا بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوا بکە خوا چاکم کاتەوە وبینینم پێ ببەخشێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ ئێستا داوات بۆ دەکەم وەگەر دەتەوێ ئارام بگریت ئەوە چاکترە بۆ تۆ).**

**ئارامگرتن گەردن کە چی دەبەخشێ بەمرۆڤ خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴾ (البقرة: ٤٥) ((ئێوە هەوڵ بدەن) پشت ببەستن بەئارامگرتن و نوێژکردن (بۆ گەیشتن بە ئامانج) بەڕاستی نوێژ ئەرکێکی گەورەو گرانە، مەگەر لەسەر ئەو کەسانەی کە بە خۆشەویستی و سۆزەوە خواپەرستی ئەنجام دەدەن و (باوەڕی دامەزراویان هەیە)...).

(١٦٧) اخرجه: احمد في (المسند) رقم (٢٨٠٥) وصححه الشيخ احمد شاكر و الشيخ شعيب الارناؤوط.

(١٦٨) اخرجه: الترمذي (٣٥٧٨) ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (١٢٩٠).

وه گێڕدراوه‌ته‌وه له‌حه‌سه‌نی به‌صری هه‌روه‌ها له‌عومه‌ری کوڕی عبدالعزیزیش (رحمهما الله تعالى) که فه‌رموویانه: "الصبر معوّل المؤمن"[١٦٩]. "ئارامگرتن قولَنگی بڕوادارانه". قولَنگ: ئه‌و جۆره چه‌کوشه نوك تیژه‌یه‌که به‌ردی پێ کون ده‌کرێت.

**١٥- ئارامگرتن هۆکارێکه بۆ سود وه‌رگرتن له قورئانی پیرۆز وپه‌ندو ئامۆژگاری یه‌کانی:**

**خوای په‌روه‌ردگار ڕوونی کردوه‌ته‌وه ئه‌وانه‌ی سود له‌ئایه‌ته‌کانی خوای په‌روه‌ردگار وه‌رده‌گرن ئه‌وانه‌ن که خۆڕاگر و سوپاس گوزارن وه‌ك ده‌فه‌رموێت:**

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ (إبراهيم: ٥). (سوێند به‌خوا به‌ڕاستی ئێمه موسامان ڕه‌وانه کرد،هاوڕێ له‌گه‌ڵ موعجیزه‌ی زۆردا (فه‌رمانما پێدا) که قه‌وم و عه‌شیره‌تت له تاریکیه‌کان ڕزگار بکه‌و به‌ره‌و نوورو ڕووناکی بیانبه، ڕۆژه‌کانی خوایان بهێنه‌ره‌وه یاد (ئه‌و ڕۆژانه‌ی که تۆڵه‌ی له بێ باوه‌ڕان سه‌ند و ئیماندارانی سه‌رخست)، بێگومان ئا له‌و به‌سه‌رهاتانه‌دا به‌ڵگه و نیشانه‌ی زۆر هه‌ن، بۆ هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی که زۆر خۆگرن (له‌کاتی ته‌نگانه‌دا)، وه زۆر سوپاسگوزاریشن (له‌کاتی خۆشیدا).

**وه‌له‌سوره‌تی لقماندا ده‌فه‌رموێت** ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ (لقمان: ٣١).(ئایا سه‌رنجت نه‌داوه که‌شتیه‌کان به ده‌ریادا هاتوچۆ دکه‌ن و نیعمه‌تی خوا دهێنن و ده‌یبه‌ن و ده‌سه‌ڵاتی خوا

---

(١٦٩) أخرجه: ابو نعيم في (الحلية) (٣٤٢/٥) ، وهناد (الزهد) (١٣٩٣) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن رجب في (جامع العلوم والحكم) (٤٨٨/١).

دەخەنە ڕوو، بەڕاستی ئا لەو شتانە دا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی زۆر دان بە خۆدا دەگرن و زۆر سوپاسگوزارن.)

**وەلەچیرۆکی سەبەئدادەفەرمویت:** ﴿فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ (سبأ: ١٩)
((ئەوان لەو نازو نیعمەتەش بێزار بوونو) وتیان: پەروەدگار نێوانی ڕێگەو سەفەرەکانمان لەیەك دوور بخەرەوە، (بەم داخوازییەیان) ستەمیان لە خۆیان کرد ئێمەش کردمانن بە داستان و باسی سەرزاری خەڵکی، وە پارچە پارچەمان کردن، بەڕاستی ئا لەو)ڕووداو بەدودۆخانەدا) بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێك کە خۆگربن لەکاتی ناخۆشی و تەنگانەدا، وە سوپاسگوزاربن لە کاتی خۆشیدا (وە هەوڵ بدەن وەکو ئەو قەومە نالەبارە بیانووگر نەبن)).

**وە خوای گەورە دەفەرمویت:** ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾(الشورى: ٣٢- ٣٣).
(لەنیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خوا ئەو کەشتیانەیە کە وەك کەژو کێو هاتووچۆ دەکەن بە دەریاکاندا، (بەیاسایەکی ڕێك و پێك)* خۆ گەرخودا بیەوێت با دەوەستێنێت و لەسەر پشتی دەریاکە دەوەستن و لە کاردەکەون، بەڕاستی لەو تواناو دەسەڵاتەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ هەر کەسێك کە زۆر خۆگرو سوپاسگوزارە..)

**ئەمە چوار شوێن بوو لە قورئاندا سورەتی (لقمان و إبراهیم و سبأ و شوری) ئاماژە بەوە دەکات کە ئایەتەکانی خوای گەورە ئەوانە سوودی لێ وەردەگرن کە لەتاقمی ئارامگر و سوپاس گوزارن..**

**ئیبن کەثیر (رحمه الله) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: " أي: إن في هذا الذي حلَ بهؤلاء من النقمة والعذاب وتبديل النعمة وتحويل العافية عقوبة على ما ارتكبوه، مِن الكفر والآثام لعبرة ودلالة**

لكل عبد صابر على المصائب شكور على النعم"[١٧٠] "ئەوەی کە توشی ئەوانە بووە لە ناڕەحەتی و سزا و گۆڕانی خۆشی بەناخۆشی و لەش ساغی بە نەخۆشی ئەوانە تۆڵە و سزابوون لەسەر ئەو تاوانانەی ئەنجامیاندا بوو، لە کوفر و بێ باوەڕی، تاوان و گوناه، ئەوانە هەموو پەند و بەڵگەن بۆ کەسێکی ئارامگر لەسەر بەلا و موسیبەت و سوپاس گوزار لەسەر خۆشی و خۆش گوزەرانی".

وە ئیمامی طەبەریش (رحمه الله) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: "إن قال قائلُ: وكيف خصّ هذه الدلالة بإنها دلالة للصّبار الشكور دون سائر الخلق ؟ قيل: لأنَّ الصَبر والشكر مِن افعال ذوي الحجى والعقول، فاخبران في ذلك لأيات لكل ذي عقل، لأن الآيات جعلها الله عبرةً لذوي العقول والتمييز"[١٧١] "گەر کەسێك بڵێت ئەم ڕێ نمونی یە چۆن تایبەتە بە ئارامگران و سوپاس گوزاران جگە لە دروست کراوەکانی تر ؟ دەڵێین: چونکە ئارامگرتن و سوپاس گوزاری لە کرداری خاوەن عەقڵ و خواستەکانە، لە مەشدا نیشانەو بەڵگەهەیە بۆ گشت کەسێکی خاوەن ژیریی و هەست، چونکە خوای گەورە ئایەتەکانی کردووەتە پەندو ئاموژگاری بۆ هۆشمەندان و هەموو خاوەن ژیریەکی جیاکەرەوەی چاك لە خراپ".

ئیبن قەیمی جەوزی (رحمه الله) دەفەرموێت:"وإنما كان الصبر والشكر سبباً الأنتفاعِ صاحبها بالآياتِ (لأن الأيمان) يُبنى على الصبر والشكر، فنصِفهُ صَّبرٌ ونصِفهُ شكرٌ، فعلى حسَب صبر العبدِ وشِكرِه تكون قَوَّةَ إيمانهِ، وآيات الله إنَّما يَنتَفعُ بِها من آمن بالله وآياتهِ، ولا يَتِمُ لهُ الايمان إلاّ بالصَّبر والشكرِ فانَّ رأسُ التوحيدِ ورأسَ الّبر تَركُ إجابة داعي الهوى فاذا كانَ مُشرِكا مَتبّعاً هَواهُ لم يكنْ صابِراً ولا شكوراً فلا تكون الآياتُ نافعةً له ولا مؤثرةٌ

(١٧٠) انظر: (تفسير القرآن العظيم) (٥/ ١٩).
(١٧١) انظر: (جامع البيان) (١٠١/١١).

فيهِ إِيماناً"[١٧٢]. "بۆچی خوای گەورە ئارامگرتن و سوپاس گوزاری کردۆتـە هۆکارێك بۆ سود وەرگرتنـی خاوەنەکـەی لـە ئایـەت و بەڵگەکانیـدا چـونکە ئیمـان و بـاوەڕ بنیـادنراوە لەسـەر ئـارامگرتن و سـوپاس گـوزاری ئیمـان نیـوەی ئارامگرتنـە و نیوەکەی تری سوپاس گوزاری یە، بە گوێرەی ئارامگرتن و سوپاس گوزاری مـرۆڤ توانای باوەڕی بەهێز دەبێت، بەڵگەو ئایەتەکانی خوای گەورە سود و قـازانجی بـۆ کەسێك دەبێت کە باوەڕی بە بەڵگە وئایەتەکانی خوای گەورە هـەبێت، وەبـاوەڕی ئـەو کەسـە کامـڵ دەبێـت بـە ئـارامگرتن و سـوپاس گـوزاری بەڕاسـتی سـەری هەرەبەرزی یەکخوا پەرستی و چاکەکردن بەدەمەوە چوون و واز هێنانـە لـە بـانگ هێشـتی ئـارەزوو هـەوا پەرسـتان، هـەر کاتێـك بـێ بڕوایـەك شـوێن کەوتـەی ئارەزووەکانی بوو ئەوە ئارامگرو سوپاس گـوزار نابێـت، وەبەڵگـەو ئایـەتی خـوای گەورەش سودی پێ ناگەیەنێت وە هیچ کاریگەری بۆی نابێت.

### ١٦- ئارامگرتن نیوەی باوەڕە:

بـەڵێ بـڕای موسـوڵمانم ئـارامگرتن بنچـینەی بـاوەڕە وەگـەورەترین کـردارە هەروەك لە هەندێك فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستدا هاتووە عومـەری کـوڕی خەطاب ﷺ دەگێڕێتەوە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ کـە فەرموویـەتی ((...الأيمـان: الصَّـبر والسَّماحة))[١٧٣] (ئیمان و بـاوەڕ بریتیـە لـە ئـارامگرتن و چـاو پۆشـی).لێـرەدا چـاو پۆشی بەمانای ئەنجامدانی کارە چاکەکانە.

---

(١٧٢) انظر: (الفوائد) (ص: ١٣١).

(١٧٣) أخرجه: احمد (٤/٣٨٥)، وَصَّحَحَه الشيخ الألبـاني في (السلسلة الصحيحة) (٥٥٤)، وفي (صحيح الجامع) (٢٧٩٥)، وفي (المشكاة) (٤٦).

ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ کە فەرموویەتی: [الصَّبر نصف الإيمان ...][١٧٤]. (ئارامگرتن نیوەی ئیمان و باوەڕه).

مەعقەلی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ کە فەرموویەتی: ((أَفضل الإيمان الصبر والسماحة))[١٧٥]. (چاکترین بەشەکانی باوەڕ ئارامگرتن و چاو پۆشیکردنه، له ڕیوایەتێکی تردا وترا: [ قيل يا رسول الله أي الأعمال أَفضل ؟ قال: ((الصَّبر والسماحة وحسن الخلق))][١٧٦]. (وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام له کردارەکان گەورەتره ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (ئارامگرتن و چاو پۆشی و ڕەوشتی جوان)).

وەزانای پایەبەرز ئیبن قەیمی جەوزی (رحمه الله) دەفەرموێت:"... الصبر نصف الإيمان: فإنه ما هيَّة مركبة من صبر وشكر. كما قال بعض السلف: (الإيمان نصفان: نصفٌ صبرٌ، ونصفٌ شكرٌ). قال تعالى: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾(الشورى: ٣٣)"[١٧٧] "....ئارامگرتن نیوەی ئیمانە: بەڕاستی ئیمان ناوەڕۆکێکە پێك هاتووه له ئارامگرتن و سوپاس گوزاری". هەروەك هەندێك لەسەلەفی سالّح دەڵێن: (ئیمان دوو بەشه نیوەی ئارامگرتنه، وەنیوەی سوپاس گوزاری یه)).

---

(١٧٤) أخرجه: الطبراني في (الكبير) (٨٥٤٤)، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني في (فتح الباري) (٤٨/١): إسناده صحيح، وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٥٧/١): رجاله رجالٌ الصحيح، وأخرجه: عبد الله بن احمد بن حمبل في (كتاب السنة) (٨١٧) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٧٥) اخرجه: ابن أبي شيبة في (الأيمان) (٤٣)، وصَّحَحَه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة) (١٤٩٥)، وفي (صحيح الجامع) (١٠٩٧).

(١٧٦) أخرجه: البيهقي (الزهد) (٨٧/١)، وقال الحافظ العراقي في (المغني) (٣/ ٢٣٨): إسناده صحيح ، وأخرجه: الإمام أحمد في(المسند)(٢٢٧١٧) وقال محققه: حديث محتمل للتحسين.

(١٧٧) انظر: (الطب النبوي) (ص: ٢٥٧)، وروى ذلك مرفوعاً عن انس: انظر: (شعب الإيمان) للبيهقي (٩٧١٥).

هـەر لـەم بارەیـەوە دەفـەرموێت عومـەری کـوڕی خـەطـاب ﷺ دەفـەرموێـت::
(.....الصبر من الايمان بمنزلة الراس من الجسد)[١٧٨] (... ئارامگرتن لـە ئیمانـدا لـە شـوێنی سەرە لەجەستەدا).

ئەمە دووبارە لە عەلی کوڕی ئەبو طالبـەوە ﷺ ڕیوایـەتکراوە کـە دەفـەرموێت: ((الصبر من الإيمان بمنزلة الرأس من الجسد، إذا قُطِعَ الرأسُ نتِنَ باقي الجسدِ، ولا أيمان لِمـن لاصَـبر لَـهُ وفي رواية: [ فإذا ذهب الرأس ذهب الجسد، وإذا ذهَبَ الصبر ذهب الأيمان]))[١٧٩] (ئارامگرتن لە ئیماندا لە شوێنی سەرە لە جەستەدا، هـەر کاتێـك سـەر ببڕدرێـت ئەندامـەکانی تری لاشە بۆن دەکات و لەناودەچێت، ئەو کەسەی ئارامگر نی یە ئیمان و بـاوەڕی نی یە. وە لەڕیوایەتێکی تردا دەفـەرموێت: کاتێـك سـەر نـەما لاشـە نامێنێـت، وە هەرکاتێك ئارامگرتن نەما ئیمان نامێنێت).

ئیبن تەیمیە (رحمه الله) لەلێك دانەوەی ئەم باسـەدا دەڵێـت: "الـدين كلـه علـم بـالحق وعملٌ به، والعمل به لابد فيه من الصبر، بل وطلب علمه يحتاج إلى الصبر، فـالعلم النـافع هـو أصـل الهدى، والعمل بالحق هو الرشاد، فلا ينال الهدى إلا بـالعلم ولا ينـال الرشـاد إلا بالصـبر ولهـذا قـال

---

(١٧٨) اخرجه: الاصبهاني في (سير السلف الصالحين) (٢١٦/١) و قال محققه: صـحيح واخرجـه ابو نعيم في (الحلية) (٧٥/١) باسنادين احدهما صحيح.

(١٧٩) أخرجه: ابن عبد البر في (جامع بيان العلـم وفضـله) بـرقم (٥٤٧) وقـال محققـه: إسـناده حسن ، وابن عساكر (١٢/ ٣٩٠)، وعبـد الـرزاق (٢١٠٣١)، وابـن أبـي شـيبة (١٠٤٨٨)، والـدينوری في (المجالسـة) (٣٠٩) وقـال محققـه: إسـناده ضـعيف، واخرجـه البيهقـي في (شـعب الأيمـان (٩٧١٨)، واللالكائي، في (شرح اعتقاد أصول أهل السنة والجماعة) برقم (١٥٦٩)، وقد ورد ذلك مرفوعـاً بلفـظ: (الصبر من الأيمان بمنزلة الـراس مـن الجسـد، فـإذا ذهـبَ الصَـبر ذهـبَ الأيمـان). اخرجـه: البيهقـي (الشعب) (٤٠)، و ابن أبي شيبة في (الأيمـان)، رقـم (١٣٠) وقـال الشـيخ الألبـاني في تحقيقـه: رجالـهُ ثقات غيران ابا إسحاق السبيعي كان اختلط ولم يسمع من عليّ رضي الله عنه وهو مدلس.

علي: (إلا أن الصبر من الإيمان بمنزلة الرأس من الجسد)"[١٨٠]. (ئاین هەمووی زانست و شارەزایی یە بەڕاستی و کردارە بەو ڕاستی یانە، وە کردار بە و ڕاستی یانە پێویستە ئارامگرتنی تێدا بێتە دی، بەڵکو گەڕان بەشوێن ئەو ڕاستیانەشدا پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، زانستی بەسوود خودی چاوگی ڕێ نوێنی یەکەیە، وەکردار بەڕاستی خستنە سەر ڕێی ڕاستی یەکەیە. وەناگەیت بەڕێگەی ڕاست مەگەر بەزانست نەبێت، وەناگەیت بەو ڕێگە ڕاستە مەگەر بەئارامگرتن نەبێت لەبەر ئەمەیە ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: " ئارامگرتن لە ئیماندا لە جێگەی سەرە لەلاشەدا".

**١٧- ئارامگرتن دەت گەیەنێتە پلەی چاکترین بەندە:**

خوای پەروەردگار ستایشی بەندە و پێغەمبەرەکەی ئەیوب ﷺ دەکات بە جوانترین مەدح و ستایش لەبەر ئەوەی باسی کردووە کە ئارامگربووە، وەك دەفـــــەرموێت: ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ (ص: ٤٤).(ئەیوب ﷺ جارێک لە خێزانەکەی دڵی ئێشا، سوێندی خوارد کە ئەگەر چاك بۆوە چەند دارێکی لێبدات، خوای میهرەبانیش وەك ڕێزێك بۆ ئەو ئافرەتە وەفادارە فەرمانی پێدا): چەپکێ لاسکی ناسك بگرێت بەدەستەوە (بەقەدەر ئەو ژمارەیەی کە بڕیاری دابوو و بیماڵێت بە هاوسەرەکەیداو فەرمووی) سوێندەکەشت مەشکێنە، ئێمە بینیمان بەڕاستی خۆگر و بەئارامگر بوویت، بەندەیەکی چاك و ڕێك و پێك بوویت، بێگومان ئەو تەوبەکارە هەمیشە دڵی لای پەروەردگارە). (**بەڕاشکاوی لەئایەتەکەدا ناوبراوەبە چاکترین بەندە لەبەر ئەوەی کەسێکی ئارامگربووە، ئەمەش ئاماژە بە وە دەکات کە سێك ئارام نەگرێت کاتێك توشی بەلاو موسیبەت ببێت ئەو کات بەبەندەیەکی گوێ ڕایەڵ وچاك لە قەڵەم نادرێت**).

---

(١٨٠) انظر: (مجموع الفتاوى) لابن تيمية (٢٧/١٠).

**١٨- ئارامگرتن ده‌بێته هۆی تیانه‌چوون و زه‌ره‌ر نه‌كردنت له دونیا و قیامه‌تدا:**

**خوای په‌روه‌ردگار ڕوونی كردووه‌ته‌وه كه زه‌ره‌رمه‌نده هه‌موو كه‌سێك ئیماندار نه‌بێت، ئه‌مه‌ش ئاماژه كردنه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی جگه له‌وان هیچ كه‌سێكی تر سودمه‌ند نی یه و قازانج ناكات. خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت:** ﴿وَٱلْعَصْرِ ۝١ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾ (العصر: ١ – ٣).

((سوێند به زه‌مانه، سوێند به‌كاتی عه‌سر.به‌ڕاستی ئاده‌میزاد له زه‌ره‌رمه‌ندی و خه‌ساره‌تمه‌ندیدایه.بێجگه له‌وانه‌ی كه باوه‌ڕیان هێناوه‌و كارو كرده‌وه چاكه‌كانیان ئه‌نجامداوه‌و ئامۆژگاری یه‌كتریشیان كردووه كه هه‌میشه پابه‌ندی حه‌ق بن (پابه‌ندی حه‌قیش پێویستی به خۆگری هه‌یه)، له‌به‌ر ئه‌وه به‌رده‌وام ئامۆژگاری یه‌كتریان كردووه تا هه‌میشه به‌رده‌وام، و خۆگرو ئارامگریش بن)).

**له‌به‌ر ئه‌مه ئیمامی شافیعی (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت: "لو فكر الناس كلهم في هذهِ الآية لوسعتهم "[١٨١]. "ئه‌گه‌ر هه‌موو خه‌ڵكی ورد ببنه‌وه له مانای ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه هه‌موویانی ده‌وڵه‌مه‌ندو بێ پێوست ده‌كرد".**

**به‌ڕاستی به‌نده پێویستی به كامڵ كردنی دوو هێز هه‌یه، هێزی زانست و هێزی كاركردن كه هه‌ردووكیان بریتین له ئیمان و كرداری چاكه، هه‌روه‌ك چۆن ئه‌و كه‌سه پێویستی به‌كامڵ كردنی خودی نه‌فسی خۆی هه‌یه ئاوه‌هاش پێویستی به‌كامڵ كردنی غه‌یری خۆی هه‌یه، ئه‌ویش وه‌سێت كردنه به‌پابه‌ند بوون، وه‌سێت كردنه به‌ئارامگرتن له‌گشت بوارێكدا، سه‌رچاوه‌ی ئه‌م دوو هێزه و یاساكانی و ئه‌وه‌ی له‌سه‌ری وه‌ستاوه ته‌نها به‌ئارامگرتن ده‌بێت.**

---

(١٨١) انظر: (شرح الأصول الثلاثة) لفضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، (ص: ٢١).

**١٩- ئارامگران گرۆهێکی بەختیارو کامەرانن:**

ئارامگرتن و بەبەزەیی بوون دوو ڕەوشتی بەهەشتیە بەختەوەرەکانن خوای پەروەردگار بەهەشتی تایبەت کردووە بۆ ئارامگران و خاوەن بەزەییەکان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴾ (البلد: ١٧ – ١٨). (سەرەڕای ئەوانەش ئادەمیزاد دەبێت لەوانەبێت کە باوەڕیان هێناوە و ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەسەر خۆگری و ئارامگری و هەروەها ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەسەر ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانی * (ئەوانەی بەو سیفەتە جوانانە خۆیان دەڕازێننەوە) ئەوانە دەستەی ڕاست و (دەستەی بەختەوەرانن).

ئەمەش تایبەت کراوە بەگرۆهی ئارامگران وبەبەزییەکان و خەڵکانیش بەختیاران و کامەرانان لەوانەی ئەم دوو ڕەوشتە بەرزەن لەسەر چوار بەشن:

أ- ئەوانەی کە ئامۆژگاری خەڵکیان کردووە کە ئارامگر و بەبەزەیی بن وەخۆشیان ناسراون بەم دوو ڕەوشتە ئەمانە چاکترین بەشیانە.

ب- وەخراپترینیان کەسێکە کە ئارامگرە بەبەزەیی نەبێت.

ج- وە هەیانە ئارامگرە بەڵام خاوەن بەزەیی نی یە.

د- وە هەیانە خاوەن بەزەییە و دڵ نەرمە، بەڵام ئارامگر نی یە.

**٢٠- ئارامگرتن پەیوەندی یەکی تونـد و پتەوی هەیە بە پایەکانی ئیسلامەوە:**

خوای گەورە ئارامگرتنی کردووەتە هاوەڵی پایەکانی ئیسلام و پلەکانی ئیمان و باوەڕ بەگشتی، ئەوەتا خوای گەورە ئارامگرتنی بەرامبەر کردووە بە نوێژەوە وەك دەفەرموێت: ﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَـٰشِعِينَ ﴾ (البقرة: ٤٥).

وه‌به‌رامبه‌ری کردووه به‌گشت کرداره چاکه‌کانه‌وه وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾(هـود: ١١). (جگه له‌و که‌سانه‌ی که خۆگرو ئارامگر بوون و کارو و کرده‌وه چاکه‌کانیان ئه‌نجامداوه (له خۆشی و ناخۆشیدا سروشتی خواناسیان ناگۆڕێت) ئا ئه‌وانه لێخۆش بوون و پاداشتی گه‌وره و فراوانیان بۆ هه‌یه).

وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی ته‌قوا وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ ﴾ (یوسف: ٩٠). وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی سوپاس گوزاری وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ إِن يَشَأۡ يُسۡكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظۡلَلۡنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٍ ﴾ (الشورى: ٣٣). وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی یه‌کتاپه‌رستی و خواناسی یه‌وه وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ ... إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴾ (العصر: ٣).

وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی به‌زه‌یی میهره‌بانی وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ ...وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴾(البلد: ١٧)

وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی دڵنیایی یه‌وه وه‌ك ده‌فه‌رموێت: ﴿ ...لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ (السجدة: ٢٤)

وه ئارامگرتنی کردووه‌ته هاوه‌ڵی ڕاست گۆیی واته : ئارامگرتن مرۆڤ به‌ره‌و ڕاست گۆیی ده‌بات وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿ ...وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ رِزۡقًا.. ﴾ (الأحزاب: ٣٥). وه هه‌روه‌هاش ئارامگرتنی کردووه ته هۆکارێك بۆ مسۆگه‌ر بوونی خۆشه ویستی و پشتیوانی لێ کردن و سه‌رخستن و پاداشتی هه‌ره گه‌وره‌ی خوا بۆ خاوه‌نه‌که‌ی.

وه دیسان ئارامگرتنی خستوەتە ڕیزی ملکەچی و ڕاست گۆیی ماڵ و داوای لێخۆش بوون (واته ئارامگرتن ئادەمیزاد دەگەیەنێته بە تەقوا و ڕاستگۆی و بەخشندەیی و داواکارانی لێ خۆش بون له خوای گەوره). وەك خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴾ (آل عمران: ١٧). ((جا ئەو ئیماندارانه، ئەمه سیفەتیانه) خۆگرو ئارامگرن (له بەرامبەر ناسۆر و ناخۆشیەکانی ژیانەوه)، ڕاستگۆو خواپەرستن، ماڵ و سامان دەبەخشن و، له بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون (له پەروەردگاریان دەکەن چونکه واهەست دەکەن که وەک پێویست خواپەرستیان نەکردووه)). **وه هەروەها خوای گەوره** دەفەرموێت: ﴿ ...وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (البقرة: ١٧٧). (ئەوانەش که له کاتی نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگرن، ئا ئەوانه کەسانێکن ڕاستیان کردووه و هەر ئەوانەشن پارێزکارو خواناس و دیندارن).

**٢١- ئارامگرتن له سیفاته جوانەکانی خوای پەروەردگاره:**

**ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ که فەرموویەتی: ((ما أَحدٌ أصبرُ على الأذى يَسمِعُه مِن الله، إنهم لَيدعون له ولداً، وإنه ليعافيهم ويرزقُهُمْ))[١٨٢] (هیچ که سێك له میانەی بیستنی وتەی ناڕەواو ناخۆشدا زیاتر ئارامگر نی یه لەخوای گەوره ئەوەتا منداڵ و شەریکی بۆ بڕیار دەدەن و دەڵێن کوڕی هەیه لەگەڵ ئەوەشدا لاشەیان ساغ دەکات وتوشی نەخۆشی و ناڕەحەتیان ناکات وەڕزق و ڕۆزیشیان دەدات).**

---

(١٨٢) اخرجه: البخاري (٦٠٩٩).

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: ((لَيس أحدٌ أصبر على أذى سمعه من الله تعالى، انهم ليدعون له ولداً، ويجعلون له أَنداداً وهو مع ذلك يعافيهم ويرزقهم))[١٨٣]، ومعناه: لاحد اشد حلما عن فاعل ذلك وترك المعاقبة عليه من الله[١٨٤]. (هیچ کەسێك لە بیستنی وتەی ناخۆش و ناڕەوادا ئارامگرتر نی یە زیاتر لە خوا ئەوەتا دەڵێن منداڵی هەیە و جۆرەها هاوبەش و هاوتای بۆ بڕیار دەدەن، بەڵام خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆزیان پێ دەدات و لەش ساغیشیان پێ دەبەخشێت).

**٢٢- ئارامگرتن هۆکارێکە بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴾ (الإنسان: ١٢). (لە پاداشتی خۆگری و ئارامگریاندا بەهەشت و ئاوریشمی پێبەخشین.) **وە دیسان خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَـٰمًا ﴾ (الفرقان: ٧٥). (ئەو جۆرە کەسانەی (کە باسکران) پاداشتیان ژوورە (ڕازاوە و بەرزو خۆشەکانی بەهەشتە) لە بەرامبەر خۆگرتن و ئارامگرتنیانەوە، جا لەوێ بە سڵاو و درووود پێشوازیان لێدەکرێت (بۆ هەمیشە دەحەوێنەوە تیایدا)). **وەخوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ (آل عمران: ١٤٢). (یان واگومانتان دەبرد (هەروا بەئاسانی) دەچنە بەهەشتەوە؟! کە هێشتا خوا (لە جیهانی واقعدا) دەری نەخستووە کامتان هەوڵ و کۆشش و جیهادی کردووەو کامتان خۆڕاگرو ئارامگر بووە...).

---

(١٨٣) اخرجه: احمد (٣٩٥/٤)، والبخاري (٧٣٧٨)، ومسلم (٢٨٠٤)، وانظر (السلسلة الصحيحة) (٢١٨٠) و (صحيح الجامع) (٥٣٧٠).

(١٨٤) انظر: (النهاية) (٧/٣).

* ئه‌بو ئه‌مامه رضي الله عنه ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ كه فه‌رموویه‌تی: ((يقول الله سبحانه وتعالى: ابن آدم إنْ صبرت واحْتَسبْتَ عِند الصَّدمة الأولى، لم ارض لك ثواباً دون الجَنَّة))[١٨٥]. (خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ئه‌ی ئاده‌میزاد گه‌ر ئارام بگریت له چركه ساتی یه‌كه‌می به‌لاّ و موسیبه‌تدا و وابزانی پاداشتت له‌لای په‌روه‌ردگارته، ئه‌واكات ڕازی نابم هیچ شتێك بكرێته پاداشتی كاره‌كه‌ت كه‌متر له به‌هه‌شت).

* عه‌تای كوڕی ڕه‌باح رضي الله عنه ده‌فه‌رموێت ئیبن عه‌باس رضي الله عنه فه‌رمووی: "ألا أريك امرأةً من أهل الجَنَّة ؟ فقلت بلى، قال: هذهِ المرأة السَّوداء أتت النَّبي صلى الله عليه وسلم فقالت: إني أصرع، وإني أتكشف، فادع الله تعالى لي، قال: ((إن شئت صبرت ولك الجَنَّة، وإن شئت دعوت الله تعالى أن يُعافيك)) فقالت: أصبر، فقالت: إني اتكشَّف، فادع الله ان لا اتكشف، فدعا لها "[١٨٦]. (ئایا ئافره‌تێكت نیشان بده‌م كه ئه‌هلی به‌هه‌شته؟ وتم: به‌ڵێ نیشانم بده، فه‌رمووی: ئه‌و ئافره‌ته ڕه‌شه‌یه، هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا من په‌ركه‌مم توشی دێت و له‌وكاته‌دا لاشه‌ی خۆم ده‌رده‌خه‌م تۆش دوعا و داوام بۆ بكه له خوای گه‌وره بۆم، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر ئارام بگریت به‌هه‌شت بۆ تۆیه، وه ئه‌گه‌ر ئاره‌زووت لێ یه دوعا و داوات بۆ ده‌كه‌م له خوای په‌روه‌ردگار كه چاكت بكاته‌وه، ئافره‌ته‌كه‌ش وتی: ئارام ده‌گرم به‌لاّم لاشه‌ی خۆم ده‌رده‌خه‌م داوا بكه له خوا كه لاشه‌ی خۆم ده‌رنه‌خه‌م. پێغه‌مبه‌ریش ﷺ ئه‌و دوعایه‌ی بۆ كرد).

---

(١٨٥) أخرجه: إبن ماجة (١٥٩٧) ، وَحَسَّنهُ الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة (١٢٩٨)، وفي (المشكاة) (١٧٥٨).

(١٨٦) أخرجه: البخاري (٥٦٥٢)، ومسلم (٢٥٧٦).

* ئەنەس ﷺدەفەرموێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەیفەرموو: ((إِنَّ الله عز وجل قال: إِذا ابتليت عبدي بحبيبتيه فَصَّبرَ عَوَّضْتُه مِنهما الجَنَّة [يُريد عينيه]))[١٨٧] (خوای پەروەردگار فەرموویەتی: هەر كاتێك بەندەكەی خۆمم توشی بەلاّی لە دەست دانی هەردوو چاوەكانی كرد و ئەویش ئارامگر بوو بەهەشتی پێ دەدەم لە جیاتی لە دەستدانی هەر دوو چاوی).

* هەر لەم بارەوەش فەرموودەیەكی تری پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنینەوە دەربارەی ئالی یاسر كە كافرەكان ئەشكەنجە و ئازاریان دەدان پێغەمبەر ﷺ بەلایانداتێ پەڕبوو و پێ فەرموون: ((صبراً آل ياسر فانَّ موعدكُمْ الجنّة))[١٨٨]. (ئارام بگرن ئەی بنەماڵی یاسر جێگەی بەیەك گەیشتنەوەتان بەهەشتە).

### ٢٣- ئارامگرتن ڕێگە بۆ مرۆڤ ڕووناك دەكاتەوە لە گشت كارەكانیدا:

* ئەبو حارسی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: ((... والصَّبرُ ضياءٌ ...))[١٨٩].: (ئارامگرتن ڕووناكی یە).

وە لەگێڕانەوەیەكی تردا لە حارسی كوڕی عاسمی ئەشعەری یەوەﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إِسْباغُ الوضُوء شَطْرُ الإيمان، والحَمْدُ لِله تملأُ الميزان، والتسبيح والتكبيرُ يملأ السمواتِ والأرضَ، والصلاةُ نورٌ، والزكاة بُرهانٌ،

---

(١٨٧) أخرجه: البخاري (٥٦٥٣)، والترمذي (٢٤٠١) ، و احمد (٣/ ٢٨٣).

(١٨٨) اخرجه: ابن هشام (٢٠٣/١)، و الحاكم (٣٨٨/٣) صححه ووافقه الذهبي، البيهقي (دلائل النبوة) (٢٨٢/٢)، وقال الهيثمي: (المجمع) (٢٩٣/٩): رواه الطبراني ورجاله ثقات، وقال الشيخ الألباني في تخريج (فقه السيرة) ص (١٠٨): حسن صحيح.

(١٨٩) اخرجه: مسلم (٢٢٣)، والترمذي (٣٥١٢).

والصَّبرُ ضِياءٌ والقرآن حُجَّةٌ لَكَ أو عليك))[١٩٠]. (دەست نوێژی تەواو وبێ کەم و کوڕی نیوەی ئیمان و باوەڕە، وە زۆر و وتنی: (سوپاس بۆ خوا) تای تەرازوو پڕ دەکات، وە وتنەوەی (سبحان الله) و (الله أكبر)یش نێوان ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکات، نوێژ کردن ڕووناکی یە، زەکاتیش بەڵگەیە، ئارامگرتنیش ڕۆشنایی یە، قورئانیش بەڵگەیە بۆ تۆ بە قازانج یان بەڵگەیە لەسەرت بەزەرەر). لەبەر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا وتراوە(من اتخذ الصبر جُنةَ وقاه الله عز وجل من عثرات الزلل)[١٩١] (هەر کەسێك ئارامگرتن بکات بەقەڵغانێك خوای پەروەردگار دەیپارێزێت لە کەوتن و هەڵخلیسکانی زەلیلی و داماوی).

### ٢٤- ئارامگرتن ملکەچی دروست دەکات بۆ خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَـٰمِ ۗ فَإِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾(الحج: ٣٤ – ٣٥). (بۆ هەر ئوممەتێك (لە ئوممەتانی پێشوو) ڕێ و شوێن و بەرنامەیەکمان بۆ داناون (بۆ خواپەرستی و قوربانی) تا ناوی خوا بەرن لەکاتی سەربڕینی ماڵاتەکاندا، خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، هەمووتان تەسلیم و ملکەچی ئەوبن، ئەوت مژدەش بدە بەبەندە ملکەچ و فەرمانبەردارو دڵ ئاوەدانەکان... * ئەوانەی کاتێك ناوی خوا برا (یا باسی دەسەڵات و ڕەحمەت و زات و سیفاتی کرا) دڵەکانیان دادەچڵەکێت و تەزووی پیادا دێت، وە ئەوانەی خۆگرو ئارامگرن لە بەرامبەر ئەو

---

(١٩٠) أخرجه: ابن ماجة (٢٨٠)، ومسلم (١/ ١٤١)، وصَحَّحَه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (٢/ ٥١١) برقم (٢٢٨٦): صحيح، وفي (صحيح الجامع الصغير) (٥٢٥) نحوه، وانظر (رياض الصالحين) بتحقيق الشيخ الألباني رقم (٢٦).

(١٩١) اورده: الدينوري في (المجالسة) برقم (١٧١٣).

ناخۆشیانەوە کە تووشیان دەبێت، ئەوانەی کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە پێمان بەخشیوون دەبەخشن).

**محمودی کوڕی لەبید ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:** ((إِنَّ اللهَ إِذا أَحَبَّ قَوماً ابتلاهم، فَمَنْ صَبَرَ فَلَهُ الصَبر، وَمَن جَزع فَلَهُ الجزع))[١٩٢] **(خوای گەورە هەر کەس وگەل و نەتەوە و میللەت یەك واتان دووبارە بوونەتەوە ومیلەتێکی خۆش بوێت گیرۆدەیان دەکات و توشی بەڵا و موسیبەتیان دەکات، هەر کەسێك ئارام بگرێت ئەوە ئارامی بۆ هەیە، وەهەر کەسێك خەم و پەژارە دایگرێت ئەوە هەر پەژارەی بۆ هەیە).**

**٢٥- ئارامگرتن ئازایەتی لە مرۆڤدا دروست دەکات:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ (الأنفال: ٦٥). **(معناه ان يصبر منكم عشرون صابرون يغلبوا مائتين)[١٩٣].(واتە: گەر بیست کەس لە ئێوە ئارامگربن سەر دەکەون بەسەر دووسەد کەسدا).**

**وە عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بەگەورە پیاوانی هۆزی بەنی عەبسی فەرموو: "(بم قاتلتم الناس) ؟ قالوا: بالصبر، لم نلق قوما الا صبرنا لهم كما صبروا لنا. وقال بعض السلف: كلنا يكره الموت والم الجراح ولكن نتفاضل بالصبر. وقال ابو محمد البطال: الشجاعة صبر ساعة"[١٩٤]. " بە چی دەجەنگان لەگەڵ خەڵکیدا ؟ وتیان: بە ئارامگرتن، ئێمە کە دەگەیشتین بە هەر کەس ولایەنێك ئاراممان دەگرت**

---

(١٩٢) أخرجه: الإمام احمد (٥/٤٢٧)، وقال ابن حجر الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٢/٢٩١): رواه احمد ورجاله ثقات، وقال محققا: (زاد المعاد) (٤/ ١٧٧): حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في: (صحيح الجامع) (١٧٠٦).

(١٩٣) انظر: (الجامع لاحكام القران) (٧/٤٤) ، و(زاد المسير) (٣/٢٨٧).

(١٩٤) انظر: (جامع العلوم والحكم) (١/٤٨٨).

لەبەرامبەریاندا تا ئـەوان لـه بەرامبەرماندا بجەنگایـەن، وه هەنـدێك لـه پێشینان فەرموویانـه: هـەموومان ڕقمـان لـه مـردن و ئەشـكەنجه و ئـازاری برینـه بـەڵام هـەموومان لـه ئارامگرتنـدا جیاوازیمـان هەیـه ". وه ئـەبو محمـدی پاڵـەوان فەرموویەتی: "ئازایەتی ئارامگرتنی سەعاتێكه".

**٢٦- ئـارامگرتن شـارەزایی لـه ئاینـدا، وبەخشـندەیی، ومیهرەبـانی و لەسـەر خـۆیی، دادپـەروەری، و زانـایی، و دەوڵەمەنـدی، ونـەرم و نیـانی، وپیـاوەتی و شتانی جوانی تر دروست دەكات لەمرۆڤدا....**

حەمزەی سومالی (رحمه الله) فەرموویەتی: ((الحِلمُ الصُبر)) (میهرەبـانی و توڕەنـه بوون لەئارامگرتنەوەیـه). وه موسـلیمی كـوڕی قەتبیـەش (رحمه الله) فەرموویـەتی: ((المرؤةُ: الصُبر على الرجال))[١٩٥]. (پیاوەتی ئارامگرتنه لەسەر پیاوان).

وەزانای پایه بەرز ئیبن قـەیمی جـەوزی (رحمه الله) فەرموویـەتی: [...إذا تأملـت مراتب الكمال المكتسب في العالم: رأيتها كلها مَنُوطةً بالصَّبر وإذا تأملت النقصان – الـذي يُذم صاحبه عليه، ويدخل تحت قدرته: رأيته كله من عدم الصبر، فالشجاعة والعفة و الجود والإيثار –كله صَبرُ ساعة فالصَّبْرُ طُّلسْمٌ عَلى كَنْزِ العُلاَ مَنْ حَـلَّ ذا الطِلَسْـمَ: فَـازَ بِكَنْـزِهِ وأكثر أسقام البدن والقلب، إنما تنشأ من عدم الصَّبر. فما حُفظت صحة القلوب والأبـدان والأرواح، بمثل الصَّبر، فهو: الفارق الأكبر والتِّرياق الأَعظم. ولو لم يكن فيه، إلا معيـة الله مع أهله: فإن الله مع الصابرين ومحبته لهم فإن الله يحب الصابرين نصرهِ لاهله ((فان النصـر مـع الصـبر)) وأنـه خـيرٌ لأهلـه ﴿وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ﴾ (النحـل: ١٢٦) وهوسبب الفلاح .... ][١٩٦] : "هەر كاتێك وردبویتـەوه لـه پلـەو پایـەكانی كـاملی

(١٩٥) اخرجه: البيهقي في (شعب الايمان) (٨٤٩٩–٨٥٠٠).
(١٩٦) انظر: (زاد المعاد) (٣٠٥/٤).

ده‌ستكه‌وتوو له‌جیهانـدا ده‌بینێـت؛ هـه‌مووی پـه‌یوه‌سـته به‌ئارامگرتنـه‌وه، وه‌هـه‌ر كاتێك ورد بویته‌وه له هه‌موو ناته‌واوی یه‌ك كه خاوه‌نه‌كه‌ی لۆمه بكرێت له‌سـه‌ری، وه‌لـه‌ژێر ده‌سته‌ڵاتیشـی بێـت، ئـه‌وه هـه‌موو بـه‌هۆی نـه‌بوونی ئارامگرتنه‌وه‌یـه، ئازایه‌تی و پاكێتی و میهره‌بانی و به‌خشنده‌یی، هه‌مووی ئارامگرتنی ساتێكه:

زۆربه‌ی نه‌خۆشی یـه‌كانی لاشـه و دڵـی مـرۆڤ بـه هـۆی نـه‌بوونی ئارامگرتنـه‌وه گه‌ش ونما ده‌كات، پارێزگاری له ته‌ندروستی دڵ و لاشه و ڕوح ته‌نها له ئـارامگرتن پارێزگاری لێ ده‌كرێت، كه‌واته ئارامگرتن جیاكه‌ره‌وه و ده‌رمانێكی زۆر گه‌وره‌یـه، ئارامگرتن هیچ شتێكی تری تێدا نه‌بێت جگه له بـوونی خـوای پـه‌روه‌ردگار له‌گـه‌ڵ ئارامگراندا هه‌ر ئه‌مه به‌س بوو بۆ زانینی نرخ و پله‌ی ئـارامگرتن، به‌ڕاسـتی خـوای پـه‌روه‌ردگار له‌گـه‌ڵ ئـارامگران دایـه و خۆشـیانی ده‌وێـت و سـه‌ركه‌وتنیان پـێ ده‌به‌خشێت (كه‌واته سه‌ركه‌وتن له‌گه‌ڵ ئارامگرتن دایه) وه ئارمگریش ده‌ستكه‌وتی هــه‌ره گه‌وره‌یــه بــۆ ئــارامگران ﴿ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴾ وه هۆكـاری ڕزگاری و سه‌رفرازییه بۆیان...".

وه‌ئیمـامی شـافیعی (رحمـه الله) ده‌فـه‌رموێت: "لايُـدرّك العِلـمُ اِلاّبالصـبرِ علـى الضُـر"[197] "ناگـه‌یت به‌زانسـت مه‌گـه‌ر بـه ئـارامگرتن له‌سـه‌ر زه‌ره‌رو زیانـه‌كان نه‌بێت". وه دووباره ده‌فـه‌رموێت: "... فحقٌ على طلبه العلم بلـوغ غايـة جهـدهم في الاستكثار منـه (أي: مـن العلـم) والصـبر علـى كـل عـارض دون طلبـه واخـلاص النيـة لله..."[198]. "..پێویسته له‌سه‌ر خوازیارانی زانست ئـه‌و پـه‌ڕی كۆشـش بكـه‌ن بـۆ

---

(١٩٧) اخرجه: الخطيب البغدادي في (الفقيه والمتفقه) وقال محققه في (صحيح الفقيـه والمتفقـه) رقم (٥٢٨): اسناده صحيح.

(١٩٨) اخرجه: الخطيب البغدادي في (الفقيه والمتفقه) وقال محققه في (صحيح الفقيـه والمتفقـه) رقم (٥٥١): اسناده صحيح.

زیاتر فێربوونی زانست، وەئارامگرین لەسەر هەموو کارێکی ڕێك ولەمپەرێك لەپێناوی فێربوونیدا، وەدڵسۆزی و نیەت پاکیان هەبێت لە فێربوونیدا بۆ خوای گەورە و میهرەبان".

ئارامگرتن بەتەنها ڕێگا ڕووناك و ڕۆشن دەکاتەوە بۆ مرۆڤ، وەزانست و زانیاری زیاتر ڕووناکی پێ دەبەخشێ لەگەڵ دانایی و ژیری و تاقیکردنەوە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((رحمه الله على موسى لو انه صبر لصاحبهِ لرأى العَجَب العُجاب ولكنه قال ((إن سألتك عن شيء بعدها فلا تصاحبني قد بلغت من لدني عُذراً))[199]. (ڕەحمەت و میهرەبانی خوا لەسەر موسا بێت گەر ئارامی بگرتایە لەگەڵ هاوەڵەکەیدا شتی زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەری دەبینی بەلآم بەهاوەڵەکەی فەرموو: گەر لە دوای ئەمە پرسیاری هیچ شتێکی ترم لێ کردی هاوڕێ یەتیم مەکە وپاساوی خۆت بۆ هەیە لەلایەن منەوە).

### ٢٧- ئارامگرتن هۆکارێکە بۆ بەردەوامی بەخشندەیی خوا:

تابیعی بەڕێز طاوسی کوڕی کەیسان (رحمه الله) دەڵێت: "إذا انعم الله على عبد نعمة ثم جعلَ اليه حوائج الناس، فان احتمل وصبر والا عرضَ تلك النعمة للزوال"[200] (هەر کاتێك خوای گەورە نیعمەتێکی خۆی ببەخشێتە بەندەیەکی و لەپاشاندا خەڵکان پێویست بەو نیعمەتەی لای ئەو بکات، گەر ئەو کەسە توانای ئارامگرتنی لەسەر جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی خەڵك هەبوو، ئەو کات خوا ئەو نیعمەتەی بۆ بەردەوام دەکات گەرواش نەکات خودا ئەو نیعمەتەی خۆی لێ دەسێنێتەوە).

---

(١٩٩) اخرجه: ابو نعيم في(الحلية) (١٧٥/٣) ، و الخطيب البغدادي في (الفقيه والمتفقه) وقال محققه في(صحيح الفقيه والمتفقه) رقم (٦٧٢): اسناده صحيح.

(٢٠٠) اخرجه: ابن ابي الدنيا في (قضاء الحوائج) برقم (٥٠).

**٢٨- ئارامگرتن هۆکارێکه بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری دونیا و قیامەت:**

میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ دەگێڕێتەوە له پێغەمبەرەوە ﷺ که فەرموویەتی: ((إِن السَعيد لَمنْ جُنب الفتنْ، ولِمَنْ أُبتُلِيَ فصَبر))[٢٠١] (بەختەوەری بۆ کەسێکه که پارێزراو بێت له ئاژاوه و شەڕوشۆڕ، وه بۆ ئەو کەسەش توشی بەلا و ئاژاوه هاتبێت ئارامی گرتبێت).

وه عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرموویەتی: (إنا وجدنا خير عِيشنا بالصبر)[٢٠٢]. (ئێمه چاکترین ژیان و خۆشیمان بەئارامگرتن دەست کەوت). پێغەمبەری خوا ﷺ لۆمەی ئەو کەسانەی دەکات کەتوشی بەلا و موسیبەت دەبن و ئارام ناگرن ئەوانەش زۆرتر ئافرەتانن . عبدالرحمن کوڕی شیبل ﷺ دەگێڕێتەوە له پێغەمبەرەوە ﷺ که فەرموویەتی: (إنَّ الفُسّاق ؟ هُمْ اَهل النّار)) قيل: يا رسول الله ومَنْ الفُسّاق ؟ قال: ((النساءُ)) قال رجلٌ: يا رسول الله اولَسَن امهاتنا واخواتنا وأزواجنا؟ قال: ((بلى ولكِنَّهم.... اِذا ابُتلينَ لم يصبَرِنَ))[٢٠٣]. (فاسق و یاخی بووان ئەوانه خەڵکی ئاگرن، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (فسّاق) کێ یه؟ فەرمووی (ئافرەتانه)؟ پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوانه دایکانی ئێمه وەخوشکانی ئێمه وه خێزانانی ئێمه نین؟ فەرمووی (بەڵێ وایه بەڵام ئەوان نیعمەتیان بدرێتێ سوپاس گوزار نابن وکاتێك توشی بەلاو موسیبەت ببن ئارام ناگرن).

---

(٢٠١) اخرجه: ابو داود (٤٢٦٣) ، وصححه الشيخ الالباني في(السلسلة الصحيحة) (٩٧٥).

(٢٠٢) اخرجه: ابن المبارك في (الزهد) برقم (٥٨٥).

(٢٠٣) اخرجه: احمد في (المسند) برقم (١٥٥٣١) وقال محققه الارناؤوط: حديث صحيح ، والحاكم (٤/٦٠٤) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

ئارامگرتن ناخی ژیری و عه‌قڵه‌، هه‌ر كه‌سێك ئارام بگرێت عاقڵ ده‌بێت وه‌ هه‌ركه‌سێك عاقڵ و ژیر بێت به‌به‌خته‌وه‌ری وخۆش گوزه‌رانی ده‌ژی، ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((العاقل مَنْ عَقِلَ عن الله عزّوجل أمره، وصبر على بلوى زمانه))[٢٠٤]. (عاقڵ وژیر كه‌ سێكه‌ له‌یاسا و فرمانه‌كانی خوا تێ گه‌یشتبێت، وه‌ ئارامبگربێت له‌سه‌ر به‌ڵاو ناڕه‌حه‌تی یه‌كانی ئه‌و سات و زه‌مانه‌ی كه‌تیایدا ده‌ژی). حارسی مه‌حاسبی ﷺ ده‌فه‌رموێت: "لكل شيء جوهر، وجوهر الانسان العَقُل، وجوهرُ العقلِ الصَبُر"[٢٠٥]. "هه‌موو شتێك گه‌وهه‌ر و ناوه‌ڕۆكێكی هه‌یه‌، گه‌وهه‌ر و ناوه‌ڕۆكی مرۆڤیش عه‌قڵ و ژیری یه‌، وه‌ گه‌وهه‌ر وناوه‌ڕۆكی عه‌قڵیش ئارامگرتنه‌". ئیمام علی ﷺ گێڕانه‌وه‌یه‌كدا فه‌رموویه‌تی: ((اطرح عنك واردات الهموم بعزائم الصبر))[٢٠٦]. (غه‌م و په‌ژاره‌كان له‌ خۆت دوور بخه‌ره‌وه‌ به‌ئارامگرتنه‌ ڕاسته‌قینه‌كان).

**٢٩-- ئارامگرتن له‌ ڕه‌وشتی پێغه‌مبه‌ران و پیاو چاكانه‌:**

خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ (الأنبياء: ٨٥)، وه‌خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ ﴾ (الأحقاف: ٣٥).

پێغه‌مبه‌ران سه‌ڵات و سه‌لامی خوایان لێ بێت له‌ هه‌موو كه‌س زیاتر توشی به‌ڵاو و موسیبه‌ت بوون، هه‌ندێكیان گیرۆده‌ی ده‌ستی خێزان و منداڵ و سه‌ر سه‌ختی قه‌ومه‌كه‌ی بووه‌ وه‌ك پێغه‌مبه‌ر نوح ﷺ وه‌، هه‌ندێكیان گیرۆده‌وی

(٢٠٤) اخرجه: البيهقي في (شعب الايمان) رقم (٤٦٨٢).

(٢٠٥) اخرجه: البيهقي في (شعب الايمان) رقم (٤٦٨٣)

(٢٠٦) اخرجه: الدينوري في (المجالسة) برقم (١٧٠٨).

بەندیخانەو ئاوارەیی بووە وەك پێغەمبەر یوسف ﷺ، وە هەندێکیان گیرۆدەی نەخۆشی و ناڕەحەتی درێژخایەن بووەتەوە لەلاشەیدا لەگەڵ فەوتان و نەمانی ماڵ و منداڵ وەك پێغەمبەر ئەیوب ﷺ وە گشت پێغەمبەرانی تریش هەریەکەی گیرۆدەی کێشەیەکی تایبەت بووە بەڵام هەموو خۆگر و زۆر بەئارام بوون.

٣٠- ئارامگرتن چەندین سوود و فائیدەی تری هەیە:

(١) ئارامگرتن بێزاری لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لەکاتی ئەنجامدانی کارێکی گرنگ لەماوەیەکی کورتدا..

(٢) ئارامگرتن پەلەکردن لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە کاتی بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

(٣) ئارامگرتن هەڵچوون و توڕەبوون لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە کاتی هاتنە دی هۆکاری توڕەبوون[٢٠٧].

(٤) ئارامگرتن ترس و دڵە ڕاوکێ لە بێ وەیی مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە کاتی ترس و تۆقیندا.

(٥) ئارامگرتن تەماع و چاو چنۆکی مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە کاتی تەماع وکۆکردنەوەی سامان.

(٦) ئارامگرتن هەڵپەکردن بۆهێنانەوەی هەموو حەزو ئارەزووەکان لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە.

(٧) ئارامگرتن توانا هەڵگرتنی هەموو ماندوو بوون و ناڕەتی و ئازارە جەستەیی و نەفسیەکان لەمرۆڤدا بەدی دەهێنێت.

---

(٢٠٧) انظر: (الاخلاق الاسلامية واسسها) (ص:٣٠٦).

⑧ ئارامگرتن خۆشه‌ویستی خوا پاشان خه‌ڵكانیش بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی مسۆگه‌ر ده‌كات.

⑨ ئارامگرتن دیارده‌یه‌كی پیاوه‌تیه و دواڕۆژێكی چاك بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی مسۆگه‌ر ده‌كات[٢٠٨].

٣١- وه له‌كۆتاییدا...... برای موسوڵمانم كۆمه‌ڵێك فه‌رمووده‌ی بۆن خۆش و بۆنداری سه‌له‌فی صالح و پیاوچاكانت بۆت باس ده‌كه‌م ده‌رباره‌ی ئه‌و سودانه‌ی كه ده‌سته به‌رده‌بێت بۆ ئارامگران:

△١ محمدی كوڕی عه‌مر ده‌فه‌رموێت ﷺ بیستم له عومه‌ری كوڕی عه‌بدول عه‌زیز ئه‌ی فه‌رموو له‌سه‌ر مینبه‌ر: "ما أنعم الله على عبد نعمة، فانتزعها منه، فعاضه مكان ما انتزع منه الصبر، إلاّ كان ما عوضه خيراً مما انتزع منه ثم قرأ ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (الزمر: ١٠)"[٢٠٩]. "خوای گه‌وره هه‌ر نیعمه‌تێكی به‌خشی بێته به‌نده‌یه‌كی پاشان لێی سه‌ندبێته‌وه و له‌جێگه‌كه‌یدا ئارامگرتنی پێ به‌خشی بێت ئه‌و كات ئه‌وه‌ی كه پێی به‌خشیوه چاكتره له‌وه‌ی كه لێی سه‌ندوه‌ته‌وه پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (ئارامگران پاداشتی بێشومار وه‌رده‌گرن).

△٢ عیمرانی كوڕی حوسه‌ین ﷺ ده‌فه‌رموێت: "ثلاثٌ يدرك بهن العبد رغائب الدنيا والاخرة: الصبر عند البلاء، والرضاء بالقضاء، والدعاء في الرخاء"[٢١٠]. "سێ شت هه‌یه به‌نده‌كان به‌هۆیانه‌وه ده‌گه‌ن به خۆشیه‌كانی دونیا و قیامه‌ت،

---

(٢٠٨) انظر: (نضرة النعيم) (٦/٢٤٧٢).

(٢٠٩) انظر: كتاب (الصبر) لابن ابي الدنيا (٢٢)، و(شعب الايمان) للبيهقي (١٠٠٣٨) ، (المصنف) لابن أبي شيبة في (٣٥٠٨٤).

(٢١٠) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٩٠).

ئـارامگرتن لـەكاتی بـەلادا، وەڕازی بـوون بـە قـەزاو قـەدەری خـوای گـەورە وەدوعاكردن و پاڕانەوە لەكاتی خۆشیدا".

٣ ئەبو دەرداء ﷺ دەفەرمویت: (من لا يُعِدَّ صبراً لفجائع الامـور يعجـز)[٢١١].

"هەر كەسێك خۆی بەئارامگرتن ئامادە نـەكات بـۆ لێقـەومان و كارەساتەكان ئـەو كات دەستەوەستان و بێ توانا دەبێت".

٤ لوقمانی حـەكیم (رحمه الله) دەفـەرموێت: "حقيقـة اليقين الصـبر وحقيقـة العمـل النية"[٢١٢]. "ڕاستی دلنیایی بڕوا بەئارامگرتنە وەڕاستی كردار بەنیەت و دڵسۆزی یە".

٥ سوفیانی كوڕی عویینە(رحمه الله) دەفـەرموێت: "كـان يقـال:يحتـاج المؤمن الى الصبر كما يحتاج الى الطعام والشراب"[٢١٣]. "بڕوادار پێویستی بـەئارامگرتن هەیـە وەك چۆن پێویستی بە خواردن و خواردنەوە هەیە".

٦ مالیكی كوڕی دینار (رحمه الله) دەفەرموێت: "ما من أعمـال الـبر عمـلٌ إلاّ ودونـه عقبية فإن صبر صاحبها أفضت به الى روحٍ وإن جزع رجع"[٢١٤]. "هـەموو یـەكێك لـە كـارە چاكەكان لەپێشدا كۆسپ و تەگەرەیەكی هەیە ئەگەر خاوەنەكەی ئـارامگربوو ئـەو كـات دەیگەیەنێتـە بـەدیهێنانی ئاواتـەكانی، و گـەر ئـەو كۆسـپەش بێـزاری بكـاتو بگەڕێتەوە ناگاتە بەدیهێنانی ئاواتەكانی".

---

(٢١١) انظر: كتاب (الصبر) لابن أبي الدنيا (٤٤).

(٢١٢) انظر: المصدر السابق برقم (٤١).

(٢١٣) انظر: المصدر السابق برقم (٨١).

(٢١٤) انظر: المصدر السابق برقم (٤٣).

 ئیبن و موبارەك (رحمه الله) دەفەرموێت: "من صبر فما أقل ما يصبر ومن جزع فما أقل ما يتمتع" (٢١٥). "کەسێ ئارامگربێت ئای ئەو ئارامگرتنە ماوەکەی چەندە کەمە وە هەرکەسێك بێزار و کۆڵ بدات، ئای ماوەی خۆشی و شادی یەکەی کەمە".

 عومەری کوڕی زەر (رحمه الله) دەفەرموێت : "من أجمع على الصبر في الأمور فقد حوى الخير والتمس معاقل البر وكمال الأجور[عليك بالصبر تدرك به ذخر أهله واعلم أن الصبر مواهب، ولن يعطاه إلاّ من كرم على سيده]" (٢١٦). "هەر کەسێك لەگشت کارەکانیدا ئارامگر بێت بەڕاستی گشت خەیرو چاکەیەکی کۆ کردۆتەوە و دەستی گرتووە بەلوتکەی چاکەو پاداشتی تەواو کامڵ". وە دووبارە دەفەرموێت:"تۆ ئارامگر بەو بزانە ئاگاداری ئارامگرتن بە دەگەیتە تێشووی ئارامگران، بزانە ئارامگرتن بەهرە وبەخششە کەسێکیش ڕێزدار نەبێت لای خاوەنەکەی ئەو بەهرەیەی پێ نابەخشرێت".

 مەیمونی کوڕی مەهران (رحمه الله) دەفەرموێت: "مانال أحد شيئا من جسيم الخير نبي فمن دونه إلاّ بالصبر" (٢١٧). "هیچ کەسێك هیچ شتێکی لە چاکەی گەورە بەدەست نەهێناوە لە پێغەمبەران بێت یان لەخوار ئەوە وە بێت تەنها لە ڕێگەی ئارامگرتنەوە بەدەستی هێناوە".

 زومرەی کوڕی حەبیب (رحمه الله) دەفەرموێت: "الصبر خير مراكب الصعب" (٢١٨). "چاکترین کەشتی بەناو ناڕەحەتیەکاندا ئارامگرتنە".

---

(٢١٥) انظر: المصدر السابق برقم (١٤٠).

(٢١٦) انظر: المصدر السابق برقم (١٦٤)، و(١٦٧).

(٢١٧) انظر: المصدر السابق برقم (١٩).

(٢١٨) انظر: المصدر السابق برقم (٢٧).

١١/ یەزیدی کوڕی تەمیم (رحمه الله) دەفەرموێت: "لما أدخل إبراهيم التيمي سجن الحجاج رأى قوماً مقرّنين في الأغلال يقومون جميعاً ويقعدون جميعاً فقال: يا أهل بلاء الله في نعمته ويا أهل نعمته في بلائه إن الله قد رآكم أهلاً أن يختبركم فأروه أهلاً أن تصبروا له" (٢١٩). "لەکاتێکدا ئیبراهیمی تەمیمی یان خستە ناو بەندیخانەکەی حەجاجەوە کۆمەڵێکی بینی بەیەکەوە کۆت و زنجیر کرابوون هەڵسان و دانیشتنیان بەیەکەوە بوو، پێی وتن: ئەی ئەوانەی کە خودا هەڵیبژاردون بۆ بەلاَ و تاقیکردنەوە و ئەوەی کردووەتە خەلاَت و دیاری بۆتان چونکە ئێوەی بەشیاو زانیووە بۆ بەلاَ و تاقیکردنەوە، ئێوەش ئارامگرن و دەری خەن کەشایستەی ئەو خەلاَت و تاقیکردنەوەن".


١٢/ ئیبن تەیمیە (رحمه الله) دەفەرموێت: "لم ينل الخير نبي فمَن دونه إلاّ بالصبر". هیچ پێغەمبەرێك لەدوای ئەوان نەگەیشتوونەتە خێر و چاکە تەنها بەئارامگرتن نەبێت. وە دەفەرموێت: "من اتقى الله وصبر فلم يدخل في الظالمين نفعه الله بتقواهُ". هەر کەسێ خۆی دوور بگرێت لە حەرام لەبەر خودا و ئارامگربێت و نەچێتە ڕێزی ستەم کارو زاڵمەکانەوە خوای گەورە بەو تەقواکاریەی سود و قازانجی پێ دەگەیەنێت، وەدەفەرموێت : "إن أعمال البر كلما عظمت كان الصبرُ عليها أعظم مما دونها" (٢٢٠).کارە چاکەکانمان هەر چەند گەورە بن ئارامگرتن لەسەریان گەورەتریان دەکات لە کارەکانی خوار ئەوان.

(٢١٩) انظر: المصدر السابق برقم (٨٣).

(٢٢٠) انظر: (مجموعة الفتاوى) (١٠/ ٣٢٥,٨٤,٧٧).

## ئەو شتانەی یارمەتیت دەدات لەسەر بەدیهێنانی ئارامگرتن

بۆ بەدیهێنانی ئارامگرتن لەکاتی دابەزینی بەلا وموسیبەتدا پێویستمان بە بەدیهێنانی چەند شتێك هەیە:

**١- ناسینی خوای پەروەردگار و باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر:**

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ (الحديد: ٢٢).(هیچ بەلاو ڕوداوێک لەزەویدا، بۆتان پێش نەهاتووەکەلە_ لوح المحفوظ _ دا تۆمارمان نەکردبێت، پێش ئەوەی ڕووداوەکە بێتە پێش، ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە)

**عەبدوللای کوڕی عەباس ﷺ دەفەرموێت: ((كُنتُ خلف النَبي صلى الله عليه وسلم يَوماً، فقال: ((يا غُلام إِني أعَلِمُك كَلماتٍ، احفظ الله يَحْفَظْكَ ...وَاْعْلَمْ: اَنَّ الأمةَ لَوْ اجْتَمَعَت على أنِ يَنفعُوك بِشَيءٍ لم يَنفعَوك الآ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ الله لَكَ، وان اجتَمعوا على آنْ يَضرّوك بِشَيءٍ لَمْ يَضروكَ الابِشَيءٍ قد كَتَبَهُ الله عَلَيكَ، رُفِعَتِ الأقلام، وجُفتِ الصُحَف))[٢٢١] (ڕۆژێك من لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بووم، فەرمووی: ئەی لاو من چەند وشەیەکت فێر دەکەم، پارێزگاری لەماف و دەقەکانی خوای گەورە بکە خوای گەورە پارێزگاریت لێ دەکات....وەبزانە گەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ ئەوەی کە سوود و قازانجت پێ بگەیەنن سوودت پێ ناگەیەنن وە گەر هەمووشیان کۆببنەوە تا زیانت پێ**

---

(٢٢١) أخرجه: احمد (١/ ٢٩٣، ٣٠٣) برقم (٢٨٠٣) وقال محققه الارناؤوط: حديث صحيح، والترمذي (٢٥١٦) وقال: حديث حسنٌ صحيح، والطبراني في الكبير (١١٢٤٣) وأبو نعيم في(الحلية) (٣١٤/١)، وصححه الشيخ الألباني في (مختصر شرح العقيدة الطحاوية) (ص: ١٣٣) ، و (صحيح الترمذي) (٢٠٤٣) ، و(المشكاة) (٥٣٠٢).

بگه‌یه‌نن ناتوانن زیانت پێ بگه‌یه‌نن مه‌گه‌ر به‌شتێك نه‌بێت که خوای گه‌وره نوسیبێتی بۆت، وه پێنوسه‌کان هه‌ڵگیراوه‌و موره‌که‌بی لاپه‌ڕه‌کانیش وشك بۆته‌وه.

وه‌پێویسته مرۆڤ نیه‌ت و مه‌ستی له ئارامگرتنه‌که‌ی ته‌نها له‌به‌ر خوا بێت، یه‌کێکله‌پیاوچاکان که‌ناوی (عبدالواحد بن زید)ه ده‌فه‌رموێت: **"من نوى الصبر على طاعة الله تعالى صبّره عليها وقوّاهُ لها، ومن نوى الصبر عن معاصي الله أعانه الله على ذلك وعصمه منها"** (هه‌رکه‌سێك له ناخی دڵیدا مه‌به‌ستی ئارامگرتن بێت له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی کاره چاکه‌کان ته‌نها له‌پێناوی خوادا، ئه‌و کات خوای گه‌وره ئارامگرتنی پێ ده‌خشێت و به‌هێزی ده‌کات له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی ئه‌و کارانه).

وه‌هه‌ر که‌سێك له ناخی دڵیدا مه‌به‌ستی ئارامگرتن بێت له‌سه‌ر خۆدوور گرتن له ئه‌نجامدانی کاره خراپه‌کان ته‌نها له پێناوی خودا، ئه‌و کات خۆی گه‌وره ئارامگرتنی پێ ده‌به‌خشێت و به‌هێزی ده‌کات له‌سه‌ر خۆ دوور گرتن و ئه‌نجام کان نه‌دانی ئه‌و کاره خراپانه).

**٢- دڵنیابوون به پاداشتی گه‌وره و جوان:**

پێویسته چاوه‌ڕوانی پاداشتی گه‌وره بکرێت له‌گه‌ڵ عاقیبه‌ت خێری، ئه‌مه‌ش یارمه‌تیت ده‌دات له‌سه‌ر ئارامگرتن به‌ڵا و موسیبه‌تت له‌سه‌ر سوك و ئاسان ده‌کات. خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿...وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل: ٩٦) (...سوێند به خوا بێگومان پاداشتی ئه‌وانه‌ی که خۆگرو ئارامگر بوون به‌جوانتر ده‌ده‌ینه‌وه له‌وه‌ی که ئه‌وان ده‌یانکرد.) **هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت:** ﴿...نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ (العنكبوت: ٥٨ – ٥٩). (...ئای چه‌ند جوانه پاداشتی ئیشکه‌ران بۆ خوا...* ئه‌وانه‌ن

خۆگربوون لەبەردەم ئەشکەنجە و ئازاری بێ باوەڕاندا و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن...)

* ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ((انَّ اللهَ عزَ وَجَلْ قال:اذا ابتليت عبدي بحبيبتيه فَصَّبَر عَوَّضته منهما الجَنة [يريد عينه]))(٢٢٢). (خوای گەورە فەرموویەتی: گەر بەندەی خۆم گیرۆدەکرد بە لەدەست دانی دووچاوە خۆشەویستەکەی و ئەو ئارامی گرت، من بۆی دەگۆڕمەوە بەبەهەشت).

* ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەفەرموێت: کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکی نارد بۆ لای باوکی و پێی وت: (انْ ابني قَدْ احُتضِرْ فاشهدنا، فأرسلَ رسول الله ﷺ يُقريء السلام ويقول ((إن لله ما آخُذ وله ما آعَطى، وكُلُّ شَيءٍ عِنده بِأجَلٍ مُسَمىًّ، فلتصبر ولتَحتَسِبْ))(٢٢٣). (کوڕەکەم وا لە گیانەڵاندایە تا ئێرە وەرە بۆ لامان پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو کەسەی ناردەوە بۆلای و سڵاوی بۆ نارد و پێی فەرموو: ئەوەی خوای پەروەردگار دەیباتەوە موڵکی خۆیەتی، وە ئەوەشی کەدەیبەخشێ هەر موڵکی خۆیەتی، وە هەموو شتێك لەلای خوا بە ئەندازە وکاتێکی دیاری کراوە ئارامبگرن و ئومێدی پاداشتان لای خوای گەورە هەبێت).

حەسەنی بەصریش (رحمه الله) سەبارەت بەم باسە دەفەرموێت: "إنما صبر على هذا الحق من عرف فضله ورجا عاقبته"(٢٢٤). (ئەکێك ئارامگرتن دەبێت لەسەر ئەم حەقە کەپلەو پایەی گەورەی بزانێت وبەئومێدی دوارەژەکەشی بێت، وەهەرواها

---

(٢٢٢) أخرجه: البخاري (٥٦٥٣)، ومسلم (٢٥٧٦).

(٢٢٣) أخرجه: البخاري (١٢٨٤)، ومسلم (٩٢٣)، والنسائي (٢١/٤)، وانظر (صحيح سنن النسائي) (١٧٦٢) وسبق تخريجه.

(٢٢٤) أخرجه: أحمد (الزهد) (٢٨٧)، والبيهقي (شعب الايمان) (٩٦٠٠) وقال محققه: اسناده حسن.

